چیرۆکی منداڵان و مێرمنداڵان

# دەرمانی ئەفسوناوی

## رۆڵد داڵ

وەرگێڕ
نەسرین ئەحمەد



رۆڵد داڵ

# دەرمانی ئەفسوناوی

وەرگێڕ

نەسرین ئەحمەد

هەولێر ـ ٢٠١٥

**خانەی موكریانی بۆ چاپ و بڵاوكردنەوەی**

- **دەرمانی ئەفسوناوی** (زنجیرەی چیرۆكی منداڵ و مێرمنداڵان)
- **رۆڵد داڵ**
- **وەرگێڕ: نەسرین ئەحمەد**
- نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ: **رێدار جەعفەر**
- نرخ: (٢٠٠٠) دینار
- چاپی یەكەم ٢٠١٥
- تیراژ: (٥٠٠)دانە
- چاپخانە: چاپخانەی **موكریانی (هەولێر)**
- لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی كتێبخانەكان ژمارەی سپاردنی (٣٩) ساڵی(٢٠١٥)ی پێ دراوە.

زنجیرەی كتێب (٩١٩)



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

پێشکەشە بە

گوڵی باخەکەم تابان گیان

کە هەر لە ئێستاوە

حەز لە خوێندنەوە و نووسینی

چیرۆک دەکات

# ناوەڕۆك

## سەبارەت بە نووسەر

رۆلد داڵ نەرویجی بوو، بەڵام لە بەریتانیا لە دایك ببوو، هەر لە وێش خوێندنی تەواو کرد. لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا بۆ کارکردن لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی **شێل** چوو بۆ ئەفریقیا. لەگەڵ هەڵگیرسانی جەنگی دووهەمی جیهانی، وەك فرۆکەوانی جەنگی چوو بۆ ناو هێزی ئاسمانی بەریتانیا، لە لیبیا و یۆنان و سوریا خزمەتی کرد. دوای ماوەیەك لە واشینگتۆن بە پلەی جێگری پەیوەندیی کاری سیاسی، لە هێزی ئاسمانی دەست بەکار بوو، هەر لەو کاتەشەوە خەریکی نووسینی کورتە چیرۆك بوو کە ناوبانگێکی زۆری پێدەرکرد. رۆڵد داڵ بە شێوەیەکی کۆمیدی و جوان، لە کەش و هەوایەکی تێکەڵ لە خەیال و راستی و وێچواندن، باسی پرسە پەرودردەیە کۆمەڵایەتییەکانی نەوەی نوێ دەکات. شێوەی نووسینەکانی نابراو زۆر دەوڵەمەند و شادی بەخشن. چیرۆکەکانی داڵ ئاوایەکی توندو هێرشبەر، هاوکات شیرین و سەرنج راکێشیان هەیە، وشە بە وشە خوێنەر بە دوای خۆییاندا رادەکێشن. ناوبراو یەکێکە لە سەرکەوتووترین نووسەری کتێبی منداڵ و مێرمنداڵان، کە منداڵانی سەرتاسەری جیهان کتێبەکانی ئەویان خوێندۆتەوە و، زۆربەی خەڵاتە بەناو بانگەکانی جیهان بەو کتێبانە بەخشراون.

بەرهەمەکانی ناوبراو بریتین لە: **چارلی و کارخانەی چکولیات، جادوگەرەکان، ماتیلدا، سەفەری تەنیا، کۆخە زەبەلاحەکە، دەرمانی ئەفسوناوی، خێزانی جەنابی گەمژە، مام ڕێوی سەر سوڕهێنەر، سالی من، چارلی و گەورە بالابەری شوشەیی، دێنی پالەوانی جیهان، دێوەزمەی میهرەبان**، کوڕ. تێکڕای ئەو کتێبانە لە لایەن چاپخانەی(**نشر مرکز**) بڵاوکراونەتەوە.

چاپخانەی(نشر مرکز) چوار کۆمەڵە کورتە چیرۆکی بڵاوکردۆتەوە، کە بۆ تەمەنی گەورەتر، بە ناوەکانی: **ژنی خاوەن ماڵ، دوێنێ جوان بوو، خاتونی من کۆترەکەم** و **خزمەتکار**.

# نەنکم

بەیانی رۆژی شەممە دایکی بە جۆرجی وت: بۆ شت کڕین دەڕۆم بۆ ناو لادێیەکە، کوڕێکی ئاقڵ بەو هار و هاجی مەکە!

ئەوەی کە هەموو جارێك دایکی ئەو قسەیەی دووبارە دەکردەوە شتێکی بێ مانا و گێلانە بوو. چونکە جۆرجی وەخۆ دەخست بیر بکاتەوە و بزانێ چ کارێکی بزۆزی و بەدفەڕی دەتوانێ ئەنجام بدات.

دایکی وتی: لە بیرت نەچێ کاتژمێر ١١ دەرمانەکان بدەی بە نەنکت، دوایی رۆیشت و دەرگاکەی داخست.

نەنکی کە لە تەنیشت پەنجەرە لەسەر کورسیەکەی وێژینگی دەهاتێ، چاوێکی بچووك و وریای کردەوە و وتی: جۆرج گوێت لێ بوو دایکت وتی چی. دەرمانەکەم لە بیر نەکەی.

جۆرج وەڵامی دایەوە: نا لە بیری ناکەم نەنەگیان.

... و هەوڵ بدە تا ئەو کاتەی دایکت لێرە نییە رەفتارێکی باشت هەبێ.

بەسەر چاو نەنەگیان.

جۆرج بە تەواوی بێزار ببوو. ئەو نە برایەکی هەبوو و نە خوشکێك. باوکی جووتیار بوو، و ئەو مەزرایەی تێدا دەژیان زۆر دوور بوو. لەبەر ئەوە هیچ منداڵێکی لێ نەبوو تا گەمەی لەگەڵدا بکات. لە چاو لێکردنی مریشك و مەڕ و مانگایان بێزار ببوو. بە تایبەتی لەوەی کە ناچار بوو لەگەڵ نەنکی، ئەو ورچە پیر و قاوەیە کە زیاتر لە ماسی دەچوو لە هەمان خانوودا بژی. ئاگاداری کردنی، ئەویش بە تەنیا، بۆ بەسەر بردنی بەیانی ڕۆژی شەممە هیچ کارێکی خۆش و سەرنجراکێش نەبوو.

نەنکی بە جۆرجی وت: دەتوانی بە دروستکردنی پیاڵە چایەك دەست پێبکەی. بەم شێوەیە چەند خولەکێك بزۆزی ناکەی.

جۆرج وتی: بەڵێ ـ باشە.

جۆرج نەیدەتوانی نەنکی خۆش بوێت. ئەو پیرێژنێکی مۆن و خۆپەرست بوو. ددانەکانی زەرد و زارە بچووکەکەی وەکو کۆمی سەگ هەڵقرچابوو.

جۆرج پرسی: نەنەگیان ئەوڕۆ چەندت شەکر بۆ لە چایەکە بکەم؟

یەك کەوچك و بە بێ شیر.

زۆربەی نەنکەکان پیرێژنێکی خۆشەویست، میهرەبان و بەکەڵکن، بەڵام ئەو هەموو دەمێ، لەسەر کورسیەکەی لە تەنیشت پەنجەرەکە دادەنیشت و بەردەوام نەقە نەق و پرتە پرتی دەکرد و لە هەموو کەس و هەموو شتێك بە کلەیی بوو. هیچ کات نەبوو، تەنانەت ئەو ڕۆژانەی کە حاڵیشی زۆر باش بوو پێبکەنێ و بە

جۆرج بڵێ : باشه، جۆرج ئەورۆ چۆنی؟ یا وەرە بەیەکەوە یاریی مار و پێیژە بکەین! هیچ کات نەبوو لە جۆرج بپرسێ: مەکتەب چۆن بوو؟ وادیار بوو ئەو جگە لە خۆی گرنگی بە کەس نادات. ئەو پیرێژنێکی بەد رەوشت و نارەسەن بوو.

جۆرج چوو بۆ چێشتخانە و بە چای سەفەری پیالێکی چا بۆ نەنکی دروست کرد. کەوچکێکیشی شەکر تێکرد، بە بێ شیر. شکرەکەی بە باشی تێکوەردا و بردی بۆ ژووری دانیشتن.

نەنکی چایەکەی تام کرد و وتی: زۆر شیرین نییە.کەمێکی تری شەکر تێکە.

جۆرج پیاڵەکەی دووبارە بردەوە بۆ چێشتخانە و کەوچکێکی پڕی شەکر



تێکرد. تێکیوەرداو بە ترسەوە بردی بۆ نەنکی.

نەنکی جۆرج وتی: کوا ژێر پیاڵە؟ من پیاڵەم بە بێ ژێر ناوێ.

جۆرج رۆیشت و ژێر پیالێکی هێنا.

ئەدی کوا کەوچك ؟ ئەگەر زەحمەت نییە، بۆم بێنە!

نەنە تێکموەرداوە. زۆر بە باشی تێکموەرداوە.

زۆر سپاس. دەمەوێ بۆ خۆم تێکیوەردەم. برۆ کەوچکێکی چام بۆ بێنە.

جۆرج کەوچکە چایەکی هێنا.

کاتێك دایك و باوکی جۆرج لە ماڵەوە بوون، هیچ کات نەنکی بەم شێوەیە فەرمانی بەسەر جۆرجدا نەدەکرد. هەر کات لەگەڵ جۆرج بە تەنیا با بەد رەفتاری لەگەڵدا دەکرد.

پیرێژن لەو کاتە کە بەو چاوە بچووك و بریقەدار و ترسناکانەی لە سەروەی پیاڵە چایەکە لە جۆرجەوە رامابوو وتی: دەزانی کێشەی تۆ چییە؟ تۆ زۆر بە خێرایی خەریکە گەورە دەبی و باڵات بەرز دەبێ. ئەو کوڕانەی وا بە خێرایی گەورە دەبن گێل و تەمبەل دەر دەچن.

جۆرج وتی: بەڵام نەنە خۆ زوو گەورە بوونم بەدەست خۆم نییە.

نەنکم بە توندی وتی: بە دڵنیاییەوە بەدەست تۆیە. گەورە بوون خوویەکی ناشیرینی منداڵانەیە.

بەڵام ئێمە دەبێ گەورد بین، نەنەگیان. ئەگەر ئێمە گەورە نەبین، هەمیشە بە بچووکی دەمێنینەوە.

ئەو شتە بێ مانایانە چییە، کوڕە. سەیری من بکە. بۆ من خەریکە گەورە دەبم؟ دیارە کە نا.

بەلاّم نەنە تۆ پێشتر گەورە بووی.

پیرێژن وەلاّمی دایەوە: کەمێك. من کاتێك کە منداڵ بووم گەورە بوونم وەلا نا. لەگەڵ خووەکانی ناشیرینی منداڵی وەك تەمبەلی و گوێڕایەڵ نەبوون و چاوچنۆکی و شل و شۆقی و گێلی و ڕێکوپێك نەبوون. تۆ هیچ کام لەوانەت ولا ناوە، وەلا ناوە؟

نەنەگیان، من هێشتا زۆر بچووکم!

نەنکم چلمەکەی هەڵلوشیەوە و وتی: تۆ هەشت سالاّنی! ئەوەندە گەورە بووی تێبگەی! ئەگەر زووتر واز لە گەورە بوون نەهێنی، ئیتر زۆر درەنگ دەبێ.

نەنە، زۆر درەنگ بۆ چ کارێك؟

ئەو بەردەوام بوو: پێکەنینداره. ئێستا تۆ تارادەیەك بە قەدەر منی.

جۆرج سەیرێکی نەنکی کرد. نەنکم زۆر وردیلە بوو. لاقەکانی ئەوەندە کورت بوون کە ناچار بوو کورسیەکی بچووك لە ژێر پێی دابنێ و سەری تەنیا دەگەیشتە ناوەراستی پشتی کورسیەکەی.

جۆرج وتی: باوکم دەڵێ بۆ پیاو وا باشە بالاّی بەرز بێ.

نەنکم وتی: بە قسەی باوکت مەکە. بە قسەی من بکە.

جۆرج پرسی: بەلاّم من دەبێ چی بکەم تا گەورە نەبم؟

ئەوەندە چکولیاتان مەخۆ. بۆ چکولیات دەبێتە هۆی گەورە بوونی مرۆڤ؟

نەنکم بە توندی وتی: دەبێتە هۆی ئەوەی تۆ بە هەڵە گەورە بی. لە جیاتی ئەوەی بچووك بیەوە باڵات بەرز دەبیٚ!

نەنکم قومێکی لە چایەکەی خواردەوە. بەڵام چاوی لەسەر ئەو کوڕە بچووکەی لە پێشی راوەستابوو، هەڵنەدەگرت. بەردەوام بوو: با هیچ کات باڵات بەرز نەبیٚ، هەمیشە بچووك بەوە.

بەسەر چاو نەنەگیان.

ئیتر چکولیاتان مەخۆ، لە جیاتان کەلەمی بخۆ.

کەلەم! ئاخ، نا، کەلەمم پێخۆش نییە.

نەنکم بە تانە لێدانەوە وتی: گرنگ نییە چیت پێخۆشە، و چیت پێخۆش نییە. گرنگ ئەوەیە چ شتێك باشە بۆ تۆ.

لەمەو دوا دەبیٚ رۆژیٚ سیٚ جار کەلەم بخۆی! یەك کیلۆ کەلەم! و ئەگەر



کرمیشی تێدا بێ ئەوە باشتریشە!

جۆرج وتی: ئاخ.

پیرێژن وتی: کرمەکان ئەقڵت بەهێز دەکەن.

جۆرج وتی: دایکم لە ناو مەغسەلەدا دەیان شواتەوە.

دایکیشت وەك تۆ تێناگات. کەلەم بە بێ کرمی کولاّو هیچ تامێکی لێ نایەت.

بە بێ هێلکە شەیتانەش بە هەمان شێوە.



جۆرج هاواری کرد: هێلکە شەیتانە، نا، ناتوانم بیخۆم.

نەنکم وتی: هەر کات هێلکە شەیتانەیەکی زیندوو لەسەر پەلکی کاهو( خاس) دەبینم، یەکسەر دەیخۆم تا رانەکات. چەند خۆش و بەتامە! ئەو لێوەکانی خڕ کردەوە و قایم بە یەکتری دادان بە شێوەیەك کە زاری وەك کونێکی چرچ و

هەڵقرچاو بچووك بۆوە. و دووبارەی کردەوە: ئەو شتانەی وەك کرم و هێلکە شەیتانە و قالۆچەی ورد و بچووك زۆر بەتامن! نازانی چەند باشە بۆ تۆ.

نەنەگیان گاڵتە دەکەی.

من هەرگیز گاڵتە ناکەم. بەڵام قالۆچەکان لە هەمووان باشترن چونکە لە بن ددانان قرچە قرچیان دێ.

نەنەگیان زۆر پیسن بێزم لێ هەڵدەستێ!

زمانی ئەو پیرێژنە عەجوزەیە بەو ددانە زەردانەوە کرایەوە. هەندێك جار ئەگەر بەخت یارت بێ لە قونچکی گەلایەکی کاهو قالۆچەیەکی بچووکت دەست کەوێ. رێك ئەو شتەیە کە من زۆرم پێخۆشە.

نەنە چۆن ئەو جۆرە شتانەت پێخۆشە؟

پیرێژن بەردەوام بوو: شتی زۆر باش دەتوانی لەسەر گەڵای کاهو بدۆزیەوە. تەنانەت هەندێك جار هەزارپێش.

جۆرج بە هاوارەوە وتی: نامەوێ هیچی تر لەم بارەوە ببیسم!

نەنکم لە حاڵێکدا لێوەکانی دەلستەوە وتی: هەزارپێیەکی قەڵەو زۆر بەتامە. بەڵام نازیزم کاتێك دەیخەیە ناو زارت دەبێ زۆر خێرا و توند و تۆڵ بی، چۆن لەسەر پشتی جووتێك چەنگاڵی تیژی هەیە کە ئەگەر زمانت بگەزێ بەری نادات لەبەر ئەوە دەبێ خێرا بی و پێش ئەوەی ئەو گازت لێ بگرێ تۆ گازی لێ بگری.

جۆرج پشتاو پشت چوو بۆ لای دەرگا. دەیویست تا ئەو جێیەی دەکرێ لەو پیرێژنە ناشیرین و رەزا گرانە دوور کەوێتەوە.

ئەو بە پەنجە ئیشارەتی بۆ جۆرج کرد و وتی: دەتەوێ لە چەنگم رابکەی، لە نەنکت رادەکەی.

جۆرجی بچکۆلە لە تەنیشت دەرگاکە راوەستا و چاوی لەو پیرێژنە عەجوزەیەوە بڕیبوو کە لەسەر کورسیەکەی دانیشتبوو. نەنکیشی بە هەمان شێوە تێەوەڕامابوو.

جۆرج چوو لە خەیاڵ وبیر کردنەوە. دەکرێ نەنکم جادووگەر بێ؟

جۆرج هەمیشە پێیوابوو جادووگەرەکان تەنیا لە ناو چیرۆکاندا بوونیان هەیە، بەڵام ئێستا زۆر دڵنیا نەبوو.

نەنکم بە پەنجە چرچ و باریکەکەیەوە ئیشارەتی بۆ کرد و وتی: وەرە پێشێ کوڕی بچکۆلە. وەرە لام، دەمەوێ هەندێك رازت بۆ بگێڕمەوە.

جۆرج لە جێی خۆیِ نەجولا.

نەنکیشی بە هەمان شێوە.

نەنکم وتی: من زۆر ڕازان دەزانم و لە پڕ زمانی کردەوە. زەردەخەنەیەکی سارد و بێ گیان، وەك زەردەخەنەی مارەکان پێش ئەوەی پێتەوە بدەن. وەرە لای نەنکت تا ئەو رازانەت بە گوێدا بڵێ.

جۆرج هەنگاوێك چوو بۆ لای دەرگا.

نەنکم بە هەمان زەردەخەنەی ساردەوە وتی: نابێ تۆ لە نەنکە پیرەکەت بترسی.

جۆرج هەنگاوێکی تر چوو بۆ پشتەوە.



نەنە لەپڕ پاڵی بە پشتی کورسیەکەیەوە دا و بە دەنگێکی گڕەوە، دەنگێك کە لەمەوپێش هیچ کات لێی نەبیستبوو، بە پچە پچەوە وتی: هەندێك پیرێژنی وەك من هێزێکی جادوویمان هەیە کە دەتوانین هەموو شتەکان بە شێوەیەکی زۆر سەیر دەربینین.

پشتی جۆرج لەسەرەوە تا خوارێ بریسکەی پێدا هات. وردە وردە دەستی کرد بە ترسان. نەنکی بەردەوام بوو: هەندێك لە ئێمە لەسەر زمانمان ئاگر و لە ناو سکمان بڵێسە و نووکی پەنجەکانیشمان جادووی هەیە...

هەندێکمان رازی وامان هەیە کە بە بیستنیان هەموو موی جەستەت قیت دەبنەوە و چاوەکانت لە سەرسامیان دەردەپەڕن.

جۆرج دەیویست ڕابکات بەڵام دەتگوت پێیەکانی بە ئەرزەکەوە نووسابوون.

ئێمە دەزانین دەبێ چی بکەین تا نینۆکەکانتان هەڵوەرن و لە جیاتان سەری پەنجەکانتان ددانی لێ بێ.

جۆرج لەرزی. لە هەموو شتێك زیاتر لە سیمای نەنکی دەترسا، لە پێکەنینی سارد و بێ گیان و چاوە بریقەدار و زەقەکانی.

ئێمە دەزانین دەبێ چی بکەین بەیانی کە لە خەو هەڵدەستی سەیری پشتەوەی خۆت بکەی و ببینی کلکێکی درێژت دەرکردووە.

جۆرج هاواری کرد: نەنە. ئیتر بەسە!

ئازیزم ئێمە رازی زۆر لە بارەی ئەو بوونەوەرە رەشانەی کە لە جێگای تاریکدا دەژین، دەسورێنەوە و غلۆران دەکەن، دەزانین...



جۆرج خۆی هەڵدایە لای دەرگاکە.

دەنگی نەنکی بیست کە دەیوت: هەر چەندە دوور بکەویەوە، دیسانیش ناتوانی رابکەی...

جۆرج رایکردە چێشتخانە و دەرگاکەی بە توندی داخست.

# پلانێکی نایاب

جۆرج لە پشت مێزی چێشتخانەکە دانیشت.کەمێك دەلەرزی. ئاخ، چەندی رق لە نەنکی بوو! بەڕاستی لەو جادووگەرە پیر و ترسناکە بێزار بوو. لەپڕ بە کەللەیدا هات بەلآیەکی بەسەر بێنێ. بەلآیەك بە تەواوی مانا، کارێکی دلّتەزێن و سەرنجڕاکێش بێ. کارێکی لەرادەبەدەر. جۆرە تەقینەوەیەك. دەیویست بۆنێکی جادوویی وەکار بخات و واز لە نەنکی نەهێنێ. هەر چەند جۆرج هەشت سالآن بوو بەلآم کوڕێکی ئازا و نەترس بوو. خۆی ئامادە کرد بوو تا لەگەلّ ئەو پیرێژنە بجەنگێ.

جۆرج بە هێواشی بە خۆی وت: من هیچ لێی ناترسم. بەلآم ترسا بوو. هەر لەبەر ئەوەش بوو دەیویست بە هەر شێوەیەك بێ بیتەقێنێتەوە!

باشە... نەك ئەوەی بەڕاستی بیەوێ بیتەقێنێتەوە، تەنیا دەیویست ئەو پیرێژنەی کەمێك بترسێنی.

زۆر باشە. بەڵام ئەو کارە دڵتەزێن و زۆر ترسناکەی کە تەقینەوەشی بە دوادایە، دەبێ چ کارێك بێ؟

پێیخۆش بوو تردقەیەك لە ژێر کورسی نەنکی دابنێ بەڵام بە داخەوە نەیبوو.

پێیخۆش بوو مارێکی سەوز و درێژ بهاوێتە ناو جلەکانی بەڵام ماری سەوزیشی نەبوو. خۆزگە دەکرا شەش دانە مشکی رەش و گەورە ببەم بۆ ژوورەکەی و دەرگای لەسەر دابخەم، بەڵام شەش مشکی گەورەشی نەبوو.



بە هەمان شێوە کە دانیشتبوو و بیری لەو مەسەلە سەرنجڕاکێشە دەکردەوە، چاوی بە شوشەی دەرمانە قاوەیەکەی نەنکی کەوت کە لەسەر دۆلابەکە بوو. وەك شتێکی رزیو دەهاتە بەرچاو. رۆژێ چوار جار و هەر جارەی یەك کەوچکی نان خواردنی لێی دەخوارد، بەلام یەك تۆزیش حاڵی پێی باشتر نەدەبوو. دوای خواردنی دەرمانەکەش هیچ گۆڕانکاریەکی بەسەردا نەدەهات. بەدڵنیاییەوە هەموو سودەکانی دەرمان ئەوەیە کە مرۆڤ چاك بکاتەوە بەلام کاتێك ئەو کارە ناکا، بە چ کەڵکێك دێ.

جۆرج لەپڕ بیرۆکەیەکی بۆ هات: ئەی گیان! ئێستا بە وردی دەزانم دەبێ چی بکەم. دەبێ بۆ نەنکم دەرمانێکی نوێ دروست بکەم. دەبێ دەرمانێکی زۆر بەهێز و توند و لەرادەبەدەر بێ، جۆرە دەرمانێك کە بە تەواوی چاکی بکاتەوە یا کەللەی لە ناو بەرێ. من دەرمانێکی جادوویی بۆ دروست دەکەم، دەرمانێك کە هیچ دکتۆرێك لە جیهاندا وەك ئەوەی دروست نەکردبێ.



جۆرج سەیری کاتژمێری چێشتخانەکەی کرد. دە و پێنج خولەك بوو. تا کاتژمێر یازدە کە کاتی خواردنی دەرمانی نەنکم بوو، نزیکەی کاتژمێرێك مابوو.

جۆرج لەسەر مێزەکە دەرپەڕی و هاواری کرد: دەی بڕۆ با بڕۆین! چاری تەنیا دەرمانێکی جادوویی بوو.

باشە ئێستا یەك سیسرکە بیخۆ و بیخۆ
یەك دانە کێچ نەنەگیان
دوو هێلکە شەیتانە پێتخۆش بوو
سێ مارمێلکە ئێستا چی دەبێ
کرمێکی بچووکی زرم و زرم و زرم
ناو دەریا و لینج دەنگی لێدێ؟
ژەهری چەقروزەی زرەگەتەی زەرد و توکن بۆم و بۆم و بۆم
ئێسقانی هاڕاو دەتەقێ؟
ئەژنۆی ورچی کیسەدار یا هەڵدەدرێتە سەر ئەرزی؟
یا دەبێتە دوکەڵ لە هەوادا؟
و شتی تر و شتی تر یا وەك شوشەی کۆکا
کە هەر کامێکیان بۆنگەنی جەستەی فش و فش و فش دەنگی لێدێ
ئەوان تێکەڵ دەکەم کێ دەزانێ؟
باش و باش و باش من نازانم

هەوێرێکی خەست و توند — وا باشترە سەبر بکەین
مادەیەکی بەهێز و توند — تا بزانین چی روویدەدا
دواییش لە ناکاو — ( چەند خۆشە ئێمە نازانین چی روویدەدا)
کارەکە تەواوە! — نەنەگیان
کەوچکێکی گەورە و پڕ — چ پلانێکم بۆ داناوی
هیچ ترسی نییە — هەر باسی مەکە، باسی مەکە!
لوتت بگرە

# جۆرج دەرمان دروست دەکات

جۆرج مەنجەڵێکی گەورەی لە ناو کەونتەرەکە دەرهێنا و لەسەر مێزی چێشتخانەکەی دانا.

دەنگێکی لەرزۆك لە ژوورەکەی تەنیشتیەوە هات: جۆرج! چی دەکەی؟

جۆرج بە دەنگێکی بەرزەوە وتی: هیچ ناکەم نەنە!

وا مەزانە چونکە دەرگاکەت داخستووە گوێم لە هیچ نییە! دەنگی تەقە تەقی مەنجەڵان دێ!

نەنە، خەریکم چێشتخانەکە خاوێن دەکەمەوە!

دوایی بێدەنگ بوو.

جۆرج گومانی نەبوو لەوەی کە دەتوانێ ئەو دەرمانە خەیاڵیەی دەیەوێ، دروستی بکات. و نەیدەویست ئەو مەسەلەیە کە ئایا ئەو مادەیەی لە ناو هەویرەکەی خۆی بکات یا بیکاتە گاڵتە جاڕی. زۆر ئاسانە ئەو پێیخۆش بوو هەر

شتێکی دەستی دەکەوێ بیکاتە ناوی. نابێ بە بێ هۆ خۆی بخافڵێنێ و نابێ دوو دڵ بێ. نابێ وابیر بکاتەوە کە ئایا ئەو مادەیە پیرێژن لە ناو دەبات یا نا.

دەبوو ئەو یاسایەی بەکار هێنابا: هەر شتێك بەر چاوی کەوتبا چ شل، چ بۆدرە، چ نووسێن دەبوو بیکردبایە ناو ئەو هەویرەی بە نیاز بوو دروستی بکات.

تاکو ئێستا هیچ کەس ئەو دەرمانەی دروست نەکردووە. ئەو دەرمانە ئەگەر نەنکم چاکیش نەکاتەوە، لانی کەم ئەنجامەکەی سەرنجڕاکێش دەبێ. دەهێنێ سەیری بکەی.

جۆرج بڕیاریدا کارەکەی لە ژوورەکانەوە دەست پێبکات و بگەڕێ و بزانێ چ شتێك دەتوانێ بدۆزێتەوە.

یەکەم جار دەبوو لە حەمامەوە دەست پێبکات. لەوێ هەمیشە یەك دونیا شتی سەیر و سەمەر هەبوو. لەبەر ئەوە بە مەنجەڵێکی گەورەوە ڕۆیشتە نهۆمی سەرەوە.

لەوێ بە زەوق و خۆشیەوە سەیری دەرمانە بە ناوبانگ و سەیرەکانی ناو دۆلابەکەی کرد. بەڵام لێان نزیك نەبۆوە. لەو ماڵەدا دۆلابی دەرمانەکان تەنیا شتێك بوو کە جۆرج بۆی نەبوو دەستی لێدا. ئەو لەم بارەوە بەڵێنی بە دایك و باوکی دابوو و نەیدەویست بەڵێنەکەی بشکێنێ. ئەوان پێیان وتبوو، لەوێ شتی وای لێیە مرۆڤ دەکوژێ، لەگەڵ ئەوەشدا جۆرج دەیویست شتێکی توند و ئاگرین بدات بە نەنکی، بەڵام لەڕاستیدا نەیدەویست جەنازەکەی بە مل دابێ. جۆرج مەنجەڵەکەی لەسەر ئەرز دانا و دەستی پێکرد.

لەسەر کاغەزی یەکەم شوشە نووسرابوو، شامپۆ جەللی زێڕی، جۆرج هەمووی کردە ناو مەنجەڵەکە و وتی: ئەو شامپۆیە ناو سکی بە جوانی دەشوات و خاوێنی دەکاتەوە.

مەعجونێکی پڕی ددانی هەڵگرت و نیوەی زیاتری وەك کرمێکی درێژ بەسەر شامپۆیەکە داکرد و وتی: لەوانەیە ئەو دەرمانە بتوانێ ددانە زەرد و پیسەکانی خاوێن بکاتەوە.

سپرای کەفی دەموچاوی باوکی هەڵگرت. جۆرج شەیدای گەمە کردن بە سپرای بوو. پەنجەی لەسەر دانا. ئەوەندەی گوشاردا تا سپرایەکە بەتاڵ بوو و کێوێکی جوان و رەنگ سپی لە ناو مەنجەڵەکەدا دروستکرد.

بە پەنجە هەندێکی کرێمی ڤیتامینداری دەموچاو هەڵگرت.



شوشەیەکی بۆیەی سووری هەڵگرت. بە خۆی وت: ئەگەر مەعجونی ددان، ددانەکانی خاوێن نەکردەوە ئەوەیان رەنگەکەی سوور دەکات وەك گوڵی سوور.

کرێمێکی ترى دۆزیەوە کە لەسەری نووسرابوو، موبرِ. لە لاقانی بدەن و پێنج خولەکی لیّ راوەستن. جۆرج هەمووی لە مەنجەڵەکە کرد.

شوشەیەکی زەردیشی لێبوو کە لەسەری نووسرابوو، ناوێکی ئاشنا بۆ دەرمان کردنی تۆشکی سەر.

قاپە بۆدرەیەکی لێبوو لەسەری نووسرابوو بۆدرەی ددان، بۆ خاوێن کردنەوەی تاقمە ددان، لەویشی هەڵگرت.

سپرایەکی تریشی دی، سپرای دژە بۆن، گەرنتی دەکەین لە ماوەی رۆژدا لەشتان بە بۆن خۆشی رادەگریّ. لە کاتی تێکردنی سپرا لە ناو مەنجەڵەکە بە خۆی وت: چەند پێویستە بۆ نەنکم.

شوشەی تر پارافینی شل[1] بوو. شوشەیەکی گەورە. جۆرج نەیدەزانی پارافینی شل هەر چییشە؟ بەڵام لەویشی تێکرد.

سەیری دەوروبەری خۆی کرد بینی هیچی تر نەماوە.

جۆرج لە ژووری نوستن لەسەر مێزی توالێتی دایکی سپرایەکی تری دۆزیەوە کە لەسەری نووسرابوو جێلی موی هێل گا، مووەکانتان بە جوانی رادەگریّ. ئەو

---

١- پارافین مادەیەکە وەك مێو، سپی و نیوە روون،بیّ بۆن و بیّ تام کە لە رۆنی قورسی نەوت بەدەست دیّ. لە دروستکردنی هەندێك لە دەرمانەکان و شتی ئارایشی و دروستکردنی مۆم بەکار دێت.

جێلەی لە دووری ٦٠ سانتیمەتریەوە بگرن و لیبدەن. نیوەی زیاتریشی لەوی تێکرد. جۆرج بە تێکردنی سپرایەکان لە ناو مەنجەڵ خۆشحاڵ دەبوو.

شوشە عەترێکیش بە ناوی گوڵی شەلغەم کە بۆنی پەنیری ماوە بەسەر چووی لێدەهات، تێکرد.

و دواییش یەك قوتوی گەورەی بۆدرە دۆزیەوە. کە لەسەری نووسرابوو گێچی پەمەیی. ئیسفنجێکی لێدانی بۆدرەشی لەسەر بوو، بۆ خۆشی، ئەویشی لە مەنجەڵەکە هاویشت.

دوو سووراوی لێویشی دۆزیەوە. مادە سوور و چەور و چۆڵەکەی لێ دەرهێنا و ئەوانیشی بەسەر شتەکانی ناو مەنجەڵەکەدا کرد.

وا دیار بوو ژووری نوستنیش هیچی تری لێ نەمابوو. لەبەر ئەوە مەنجەڵەکەی هەڵگرت و دووبارە رۆیشتەوە بۆ نهۆمی خوارەوە و خێرا چوو بۆ شوێنی جل شوشتن، ئەو شوێنەی کە قەفەزەکانی پڕ بوو لە خرتە و پرتەی جۆراوجۆر.

یەکەم شت کە هەڵیگرت سندوقێك بوو لەسەری نووسرابوو:

***بۆدرەی سپی کەرەوەی جل شۆری ئوتوماتیك. مادەیەکی ئەفسوناوی بۆ نەهێشتنی پیسی.***

جۆرج نەیدەزانی نەنکی ئوتوماتیکە یان نا، بەلّام دڵنیا بوو پیرێژنێکی پیس و چەپەڵە. و وتی: ئەگەر وایە بە کەلکی نەنکم دێ. هەمووی کردە ناو مەنجەڵەکە.

قوتوەکەی دواتر پاککەرەوەی کاشی بوو. لەسەری نووسرابوو ***پەڵە پیسەکانی سەر کاشیەکان لادەبات و هەموو شوێنێك وەبریقە دەخات.*** جۆرج مادە رەنگ پرتەقاڵیەکەی لە ناو قوتوەکە هێنایە دەر.

لە لایەکەی تری قوتوەکە نووسرابوو ***بۆدرەی کێچ بۆ سەگەکان. لە خواردنی سەگەکانی دوور بخەنەوە، ئەگەر سەگەکان بیخۆن پێی دەتەقن.***



جۆرج لەگەڵ بەتاڵ کردنی بۆدرەکە وتی: زۆر باشە

لەسەر قەفەزەکە خواردنی کەناریەکانی بینی، ئەویشی تێکرد. لەوانەیە ببێتە هۆی ئەوەی باڵندەی پیر دەست بکات بە ئاواز خوێندن.



هەروەها جۆرج کەل و پەلی بۆیاغ کردن واتە، فلّچە و قوتوی بۆیاغەکەی دۆزیەوە. بیری کردەوە، باشە دەرمانی نەنکم قاوەییە، بۆیە دەرمانی منیش دەبێ قاوەیی بێ ئەگینا نەنکم دەکەوێتە گومانەوە.

بڕیارمدا بۆ رەنگی دەرمانەکە، بۆیاغی قاوەیی بەکار بێنم. لەسەر قوتویەکی گەورە کە جۆرج هەڵیبژارد، نووسرابوو، ***قاوەیەکی تۆخ***. لەرادەبەدەرە. بە کەوچکێکی کۆن تەواوی بۆیاغەکەی کردە ناو مەنجەڵەکە. دوایی لێکیدەدەم.

پێش ئەوەی بگاتەوە چێشتخانە شوشەیەکی ویسکی **جین** لەسەر دۆلابەکە دی. نەنکی زۆری **جین** پێخۆش بوو. رێگەی پێدرابوو ئێواران چەند قومێکی لێ بخواتەوە. بەلام خواردنەوەی لەو کاتەی رۆژدا مەترسیدار بوو. بڕیارەیدا هەموو شوشەکە بکاتە ناو مەنجەڵەکە. ئەو کارەشی کرد.

جۆرج گەڕایەوە چێشتخانە و مەنجەڵەکەی لەسەر مێزەکە دانا و چوو بۆ لای دۆلابەکە کە لەراستیدا مەخزەنی خواردەمەنی بوو. قەفەزەکان پڕ بوون لە جۆرەها شوشە مەربیا. ئەو مادانەی هەڵگرت و یەك بە یەك کردنیە ناو مەنجەڵەکە:

یەك قوتو بۆدرەی کاری

یەك قوتو بۆدرەی کولەکە

شوشەیەك سۆسی بیبەری سوور و توند

یەك قوتو بیبەری رەش

شوشەیەك سۆسی توری کێوی

جۆرج بە دەنگێکی بەرز وتی: ئەو لایەش دەبێ ببینم.

لە ژوورەکەی تەنیشتی دەنگێکی گڕ و ناخۆش هات: جۆرج! لەگەڵ کێ قسە دەکەی؟

خەریکی چی؟

جۆرج وەڵامی دایەوە: هیچ ناکەم نەنە، هیچ کارێکی ناکەم.

هێشتا کاتی خواردنی دەرمانەکانم نەهاتووە؟

نا نەنەگیان، نیو کاتژمێری تر ماوە.

باشە، لە بیری نەکەی.

نا نەنەگیان، بەڵێن دەدەم لە بیری ناکەم.

# حەبی ئاژەلاّن

جۆرج هەناسەیەکی قولّی هەلّکێشا. هەر چەندە قەفەزی دەرمانەکانی ناو مالّیّ لە جۆرج قەدەغە کرابوو، بەلاّم ئایا دەست لیّدان لە دەرمانەکانی باوکی کە لە ناو دۆلاّبیّکدا بوون لە تەنیشت کولانەی مریشکەکان، واتە دەرمانی ئاژەلاّنیش قەدەغە کرابوو؟ کەس پیّی نەوتبوو نابیّ دەستیان لیّبدات.

هیچ کەس تاکو ئیّستا پیّی نەوتبوو کە نابیّ دەستیان لیّبدات.

جۆرج بە خۆی وت: سەبرکە بیبینم، سپرای مو و مەعجونی ریش و بۆیاغی پیّلاّو زۆر باشن و دلّنیام دەبنە هۆی ئەوەی تەقینەوەی بەشکۆ لە ناو سکی پیرێژندا رووبدات! بەلاّم ئەوەی کە لیّکدانی جادوویی پیّویستی پیّیەتی یەك مادەی واقعییە، حەبی واقعی و بەهیّزکەری واقعی تا هیّز و توانایەکی زۆری پیێ ببەخشیّ.

جۆرج زۆر بە زەحمەت مەنجەلّەکەی، کە سیّ لەسەر چواری پڕ ببوو توانی بلّند بکات و لە دەرگای پشتەوە بردی بۆ دەرەوە. حەوشەی مەزراکەی تێپەڕاند و چوو

بۆ لای مەخزەنەکەی تەنیشت کولانەی مریشکەکان. دەیزانی باوکی لەوێ نییە. چونکە لە یەکێك لە لەوەڕگایەکان خەریکی ویشك کردنی گیا بوو.

جۆرج چوو بۆ ناو مەخزەنە پڕ لە تۆز و خۆڵەکە و مەنجەڵەکەی لەسەر مێزێك دانا، دوایی سەیری قەفەزی دەرمانەکانی کرد پێنج دانە شوشەی گەورەی لەوێ بوو. دوو لە شوشەکان پڕ بوون لە حەب و دووی تریشیان پڕ بوو لە جۆرە شلەیەك و یەکەکەی تریش پڕ بوو لە بۆدرە.

جۆرج وتی: لە هەمووانیان کەڵك وەردەگرم. نەنکم پێویستی بە هەمووانە.

یەکەم شوشە کە هەڵیگرت بۆدرەیەکی پرتەقاڵی بوو. لەسەری نووسرابوو، بۆ ئەو مریشکانەی تووشی نەخۆشی بۆگەن، ئەنفولانزای باڵندە، دەنووکی بریندار، شەلینی فروج (کەڵەباب بە جوجکەیی) بوونی کێشە لە هێلکە کردن، کەمی تووك و پەڕ، کەوچکێك لەو بۆدەرەیە لەگەڵ سەتلێك دانی مریشکان تێکەڵ بکەن.

جۆرج بە دەنگێکی بەرز لەو کاتەی شوشەکانی بەتاڵ دەکرد بە خۆی دەوت: دەی باشە باڵندەی پیر دوای ئەوەی کەمێکت لەوە خوارد هەرگیز پەڕەکانت ناودرێ.

شوشەکەی تری هەڵگرت کە نزیکەی پێنسەت حەبی رەنگ ئەرخەوانی گەورەی تێدا بوو. ***بۆ نووسانی دەنگی ئەسپەکان. ئەو ئەسپەی دەنگی نووساوە دەبێ رۆژێ دوو جار لەو حەبانە بخوات.***

جۆرج وتی: راستە نەنکم دەنگی نەنووساوە، بەڵام بەدڵنیاییەوە زمانێکی درێژی هەیە. لەوانەیە ئەو حەبانە لە جیاتی ئەو، چارەسەری زمانی بکەن. چوو بۆ لای مەنجەڵەکە و پێنسەت حەبی گەورەی تێکرد.

ئەو جارە نۆبەی شوشەی شلە زەردەکە هات. بۆ مانگا و جوانەگا و گا خەسیوەکان، دەرمانی ئاوڵەی گا وگۆل، گەڕی، شاخی نووشتاوە، تەنگی هەناسەی جوانەگایەکان، ژانی گوێ، ژانی ددان، ژانە سەر، ژانی کلك، ژانی سم و ژانی مەمك.



جۆرج وتی: مانگا پیرەی بەد رەوشتی ژووری دانیشتن هەموو ئەو نەخۆشیانەی هەیە. پێویستی بەو دەرمانەشە. شلە زەردەکەشی قلّپ کردەوە سەر مەنجەڵەکە، کە ئیتر پڕ ببوو.

شوشەکەی تر شلەیەکی سووری کاڵی تێدا بوو. لەسەری نووسرابوو، ***گیراوەی خاوێن کردنەوەی مەڕ و ماڵات. پاککەرەوە. دژە پەڵە. دژی کێچ و گەنە.***

***کەوچێکی بکەنە ناو یەک جریکانە ئاو و مەرەکانی پێی بڕشێنن. هۆشیار کردنەوە! گیاوەکەی خەستتر مەکەن چونکە خوری مەڕکان لێدەبێتەوە و روت دەبنەوە.***

جۆرج وتی: ئای چەندەم پێخۆشە بچم و نەنکم بەو گیراوە بڕشێنم و بزانم چۆن کێچ و گەنەکانی لێ هەڵدەوەرن. بەڵام ناتوانم. نابێ ئەو کارە بکەم. لە جیاتان دەبێ بیخواتەوە. ئەو دەرمانە سوورەکەشی کردە ناو مەنجەڵەکە.

دوایین شوشە لەسەر قەفەزەکە پڕ بوو لە حەبی سەوزی کاڵ. ***حەبی بەراز. بۆ خوران، برینی لاق و ڤایرۆسی سەر و نەخۆشی بەرازان. رۆژی یەک حەب. هەندێک جار دوو حەب، بەڵام لەوە زیاتر دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەرازەکە سەمای ئاندرۆل[2] بکات.***

---

٢- جۆرێکە لە مۆسیقا و سەمای پاپ



جۆرج وتی: ئۆی دروست دەرمانی ئەو بەرزاە پیر و داماوەیە کە لە ناو ماڵێ دا خۆی مات کردووە. نەنکم پێویستی زۆری بەوەیە. ئەو هەموو حەبە سەوزەکان کە سەت دەنك زیاتر بوو کردیە ناو مەنجەڵەکە.

دارێکی کۆن لەسەر مێزەکە بوو بە کەڵکی تێکوەردانێ دەهات. جۆرج دارەکەی هەڵگرت و مەعجونی ئەفسونگەری تێکوەردا. مەعجونەکە وەکو کرێم توند ببوو و لەگەڵ تێکوەردان و تێکەڵکردن، رەنگی جوان و سەرنجڕاکێش لە بنی

مەنجەڵەکە دەهاتنە سەرەوە. پەمەیەکان، شینەکان، سەوزەکان، زەردەکان و قاوەیەکان بەیەکەوە تێکەڵ دەکران.

جۆرج ئەوەندە ئەو کارەدا بەردەوام بوو تا مەعجونەکە بە باشی تێکەڵ بکرێ، بەڵام هێشتا یەك دونیا حەب لە بنی مەنجەڵەکەدا مابوو کە نەتوابوونەوە. ئیسفنجی لێدانی بۆدرەی دایکی لەسەر ئاوەکە مەلەی دەکرد. جۆرج وتی: وا باشترە بیکوڵێنم، پێویستی بە کوڵینێکی خێرا هەیە لەسەر تەباخ. بە لۆژە لۆژ بەو مەنجەڵە قورس و گەورەوە رۆیشتەوە بۆ لای ماڵێ.

لە کاتی تێپەڕ بوونی، لە پێش گەراجەکە چاوی بەولاو بەملادا گێڕا تا ئەگەر شتێکی سەرنجڕاکێشی بەرچاو کەوت ئەوەیشی لەگەڵ تێکەڵ بکات. لەبەر ئەوە ئەو شتانەشی بە مەعجونەکە زیادکرد:

نیوە قوتویەك رۆنی ماتۆڕ ـ تا ماتۆڕی نەنکم بە نرمی و جوانی ئیش بکات.

هەندێك دژە بەفر ـ تا لە زستاندا رێگە بگرێ لە سەهۆل بەستنی رادیاتۆری نەنکم.

مستێك گریس ـ بۆ چەوەر کردنی سیڕە سیڕی جومگەکانی نەنکم.

دواتر گەڕایەوە بۆ چێشتخانە.

# کوڵاندن

لە چێشتخانە جۆرج مەنجەڵەکەی خستە سەر تەباخەکە و تا ئەو جێیەی دەکرا ئاگرەکەی زیاد کرد.

لە ژووری تەنیشتەوە دەنگێکی ترسناك هات. جۆرج! کاتی دەرمانەکانم هاتووە!

جۆرج وەڵامی دایەوە: هێشتا نا نەنەگیان. بیست خولەکی ماوە بۆ کاتژمێر یازدە.

نەنکی هاواری کرد: ئەوە خەریکی چی؟ گوێیم لە دەنگە دەنگێکە.

جۆرج پێی باش بوو ئەو جارەی وەڵامی نەداتەوە. کەوچکێکی داری گەورەی لە ناو یەکێك لە چەکمەجەکانی مێزی چێشتخانەدا دۆزیەوە و دەستی کرد بە تێکووەردان. مادەکانی ناو مەنجەڵەکە گەرمتر و گەرمتر دەبوو.



هێندەی پێنەچوو مەعجونەکە بە شێوەیەکی سەیر و سەمەر دەستی کرد بە قوڵتە قوڵت و کەف کردن. دوکەڵێکی شینی تۆخ لە رەنگی پەڕەکانی تاوس بەرە بەرە بەرز بۆوە و بۆنێکی توند و ناخۆش چێشتخانەی پڕ کرد. بە شێوەیەك کە بوو بە هۆی ئەوەی جۆرج بترسێ و پچڕ پچڕ قسە بکات. تا ئەو کاتە هەستی بە بۆنێکی ئەوها نەکردبوو. بۆنێکی تاڵ و جادوویی، توند و ئاگرین و هۆشبەر کە پڕ بوو لە موعجیزە و جادوو. هەر شوێنێکی بۆن کردبایە وەك ئەوەی کە ترەقە لە ناو میشکیدا بتەقێتەوە. ئەو شۆکە کارەبایانەی کە بە پشتی پێیدا دەچوونە خوار. راوەستان و رامان لە دوکەڵی ئەو مەعجونە سەیر و سەمەرە کە قوڵتە قوڵتی دەهات و دەکوڵی، لەرادەبەدەر بوو. جۆرج دەیتوانی سوێندێ بخوات کە لە یەك چرکەساتدا، بریسکەی روونی ناو بڵۆقەکانی بینیوە کە دەدرەوشانەوە.



و له ناکاو تێگەیشت که خەریکی سەما کردنە لە دەوری ئەو مەنجەڵەی که هەر قولّتان دەدا و وشەی سەیر و سەمەر دەڵێ بە دەنگێکی بەرز که کەس نەیدەزانی چۆناو چۆن دێنە ناو میشکی:

سوپێکی توند و تیژە        سەیری ئێرە بکە! ئۆۆۆۆی
خۆراکێکی بەتامە        فیش و فیش و فیش
پڕە لە دوکەڵ        تەق و تەق و تەق
پڕە لە کەف        وەی و وەی و وەی
پڕە لە غاز        چ شتێکە!
چ مەعجونێکە        دوعاکەت بخوێنە دایە گیان!
بەبە و بەبە!

# ڕەنگی قاوەیی

جۆرج ئاگری تەباخەکەی کوژاندەوە. دەبوو ماوەیەك سەبر بگرێ تا مەنجەڵەکە سارد بێتەوە.

کاتێك هەڵمەکە تەواو بوو و مەعجونەکە لە قوڵتە قوڵت کەوت، بە وردی سەیری ئەو مەنجەڵە گەورەی کرد تا بزانێ ئەو دەرمانە دەگمەنە چ ڕەنگێکە. هەم شینێکی تۆخی بریقەدار و هەمیش کاڵ بوو.

جۆرج لای خۆی وتی پێویستی بە کەمێك ڕەنگی قاوەییە. بەدڵنیاییەوە دەبێ قاوەیی بێ ئەگینا نەنکی لێی بە گومان دەبێ.

جۆرج ڕایکردە دەرەوە و بە پەلە چوو بۆ مەخزەنی باوکی، ئەو شوێنەی کە ڕەنگەکانی لێ دانابوو. ڕیزێك قوتو لەسەر قەفەزەکە بوو. لە هەموو ڕەنگەکان، ڕەش و سەوز، سوور، پەمەیی، سپی و قاوەیی. گەیشتە ڕەنگی قاوەیی. لەسەر قوتوەکەی نووسرابوو، ڕەنگی پلاستیکی قاوەیی تۆخ، یەك لیتر. دەرنەفیزی هەڵگرت و بە زۆر سەرەکەی کردەوە. یەك لەسەر چواری قوتوەکە بەتاڵ بوو.

رایکرد بۆ لای چێشتخانەکە. تەواوی رەنگەکەی کردە ناو مەنجەڵەکە. مەنجەڵەکە لێواو لێو ببوو. جۆرج بە ئارامی بە کەوچکە دارێکی درێژ تێکەڵی کرد. ئەها! بوو بە قاوەیی! یەك رەنگی پلاستیکی قاوەیی لەرادەبەدەر!

لە ژووری دانیشتن دەنگی نەنکی هات: دەرمانەکەم چی لێ هات، کوڕە؟ تۆ منت لە یاد کردووە! هەر بە دوای کاری خۆتی! بە دایکت دەڵێم!

جۆرج وەڵامی دایەوە: لە بیرم نەکردووی نەنەگیان. هەمیشە بە یادی تۆم. بەڵام هێشتاش دە خولەکی ماوە.

دەنگە گڕ و ناخۆشەکەی نەنکی دووبارە هاتەوە، تۆ کرمێکی بچووك و پیسی! کرمێکی بچووك و بێ گوێ و تەمبەل کە هەر لە خۆڕا گەورە دەبی.



جۆرج رۆیشت و شوشە واقعیەکەی دەرمانی نەنکی لە کەونتەرەکە هێنایە دەر. سەرەکەی هەڵگرت و هەمووی کردە ناو مەغسەلە. دوایی بە دۆلکەیەکی بچووك، شوشەی دەرمانەکەی پڕ کرد لەو مەعجونەی دروستی کردبوو و سەرەکەی لە جێی خۆی دانایەوە.

ئایا بە ئەندازەی پێویست سارد ببۆوە؟ بە تەواوی نا. شوشەکەی چەند خولەکێك لە ژێر ئاوەساردەکە دانا. کاغەزەکەی سەری لێببۆوە بەڵام کێشە نەبوو. دوایی شوشەکەی بە دەسرەیەك ویشك کردەوە.

هەموو شتێك ئامادەیە!

خۆیەتی!

چرکەساتی کۆتاییە!

جۆرج وتی: نەنەگیان، کاتی خواردنی دەرمانەکەتە!

وەڵامێك بە تورەییەوە هات، هیوادارم!

کەوچکی نان خواردنی زیوی تایبەت بە دەرمانی نەنکم هەمیشە لە ناو دۆلابی چێشتخانەدا بوو. جۆرج هەڵیگرت.

لە کاتێکدا کەوچکەکەی لە دەستێکدا و شوشەکەش لەدەستەکەی تریدا بوو هاتە ناو ژووری دانیشتن.

# دەرمانی نەنکم

نەنکی لە تەنیشت پەنجەرەکە لە ناو کورسیەکەیدا خۆی کروشم کردبوو و بە چاوە بچووك و ترسناکەکانی بە وردی سەیری جۆرجی دەکرد کە دەهات بۆ لای.

بە جنێودانەوە وتی: بۆ درەنگ هاتی.

پێموا نییە نەنە.

نەنکی هاواری کرد: قسەکەم پێمەبڕە!

بەڵام نەنە خۆ قسەکەت تەواو کردبوو.

نەنکی قیژاندی: وا باشە دووبارە بڕۆی، هەمیشە قسەکەم پێدەبڕی و دواییش دەست دەکەی بە مناقشە. بەراستی منداڵێکی بێزارکەری. کاتژمێر چەندە؟

ڕێك کاتژمێر یازدەیە، نەنەگیان.

وەك هەمیشە درۆ دەکەی. زۆر قسان مەکە و دەرمانەکەم بدەیە. یەکەم جار رایوەشێنە. دوایی لە ناو کەوچکی بکە، دەبێ کوچکەکە بە تەواوی پڕ بێ.

جۆرج پرسی: دەتەوێ هەمووی بە یەگجاری بخۆیەوە؟ یان وردە وردە دەیخۆیەوە؟

پیرێژن وتی: هەر کارێکی بیکەم پەیوەندی بە تۆوە نییە. کەوچکەکە پڕ بکە.

جۆرج سەری شوشەکەی لابرد و زۆر بە ئارامی دەستی کرد بە تێکردنی ئەو مادە قاوەیی و توندە لە ناو کەوچکەکە. بەڵام نەیدەتوانی بیر لەو شتە سەیر و سەمەرانە نەکاتەوە کە بۆ دروستکردنی ئەو مەعجونە بێ وێنەیە بەکاری هێنا بوون ـ کەفی ریش تاشین، موبرٍ، دەرمانی چارەسەر کردنی تۆشکی سەر، تایتی جل شۆری ئوتوماتێك، بۆدرەی کێچ بۆ سەگان. بۆیاغی پێڵاو، بیبەری رەش، سۆسی توری کێوی و هەموو ئەو شتانەی کە لەوێ بوون، شەربەتەکان و بۆدرەکان و حەبەکانی ئاژەڵی بەهێز... و رەنگی پلاستیکی و قاوەیی.

جۆرج وتی: نەنەگیان، زارت بکەوە. دەمەوێ بیکەمە ناو زارت.

عجوزەی پیر زارە بچووك و هەڵقرچاوەکەی بەو ددانە زەرد و هێڵنج هێنەرانە کردەوە.

جۆرج هاواری کرد: ئۆخەی! قوتی بدە! کەوچکەکەی لە زاری هاویشت و مەعجونەکەی کردە ناو زاری. پشتاو پشت رۆیشت تا ئەنجامەکەی ببینێ.

دێنێ سەیری بکەی.

نەنکی هاواری کرد: ئەی! و تەواوی جەستەی ویژەیەکی کرد ودەرپەڕی بۆ سەرێ. رێك وەك ئەوەی وەیارێکیان لە ژێر کورسیەکەوە لە کارەبا دابێ بۆ هەوا هەڵدرا. وەك گەمەکانی عەلی بچووك دەرپەڕیە سەرەوە... و نەهاتەوە خوارێ... هەر لەوێ مایەوە... هەڵواسراو لە نێوان ئەرز و هەوادا... نیو مەترێك لە ناو

هەوادا بوو... بە دانیشتوویی... ویشك ببوو... سەهۆڵی بەستبوو... دەلەرزی... چاوی پێی زەق ببوون... مووەکانی قیت ببوونەوە...

جۆرج بە ئەدەبەوە وتی: کێشەیەکت بۆ دروست بووە نەنە؟ حاڵت باشە؟

پیرێژنی عەجوزە کە لە هەوادا هەڵواسرابوو دەتگوت لە دونیایەکی تردا قسە دەکات.

ئەو زەربە توندی کە بە هۆی دەرمانەکەی جۆرجەوە پێی کەوت زۆر ترسناك بوو.

شێوەیەی دەرپەڕینی نەنکی لەسەر کورسیەکە وەك ئەوە بوو شیشەیەکی گۆشت برژاندنی قوت دابێ. دوایی شلّپ بەربۆوە سەر جێیەکی خۆی، سەر کورسیەکە.



نەنکی هاواری کرد: ئاگر کوژێنەوەی خەبەرکە، مەعیدەم ئاگری گرتووە.

جۆرج وتی: نەنە، تەنیا کاریگەری دەرمانەکەیە! کەمێك بەهێزە.

پیرێژن قیژاندی: ئاگر، ئاگر کەوتنەوە لە ژێر زەوی! راکە سەتڵ بێنە! سۆندەی ئاوەکە بکەوە! زووکە شتێك بکە!

جۆرج وتی: نەنە، ئارام بە. بەڵام کاتێك دیتی لە زار و لوتی نەنکی دوکەڵ دێتە دەر کەمێك حەپەسا. هەورێك لەو دوکەڵە رەشە کە لە لوتی دەهاتە دەر لە ژوورەکەدا بڵاو دەبۆوە.

جۆرج وتی: وەی، خۆ بەڕاستی ئاگرت گرتووە!

نەنکی هاواری کرد: دیارە ئاگرم گرتووە. سوتام! وەك چەوەندەر کولێیم! خەریکە دەبم بە خەڵۆز.

جۆرج ڕایکردە چێشتخانەکە و بە یەك دۆلکە ئاوەوە گەڕایەوە. هاواری کرد: نەنە زارت بکەوە. جۆرج بە زەحمەت دەیتوانی لە ناو ئەو هەموو دوکەڵەدا ببیبینێ، بەڵام نیوەی دۆلکەکەی لە گەروی کرد. سکی نەنکی دەنگی فشەیەکی لێ هات، لەو دەنگانەی کاتێك تاوەی زۆر گەرم دەخەیە ژێر ئاوی سارد. ئەو پیرێژنە عەجوزەیە دەست و پێی داویشتن، هار ببوو وەك ئەسپ دەنگی فنە فنی لێدەهات. خێرا خێرا هەناسەی دەکێشا و خورە خوڕی لێدەهات و وەك نافورە ئاوی لێ دەهاتە دەر. و لە کۆتاییدا دوکەڵەکە تەواو بوو.

جۆرج بە غرورەوە رایگەیاند: ئاگرەکە کوژایەوە. نەنە ئێستا باش دەبی.

نەنکی هاواری کرد: باش؟ کەی باش دەبیٚ؟ لە ناو سکم بوونەوەر هەڵپەڕ و داپەڕ دەکات! دەوروبەری ناوکم پڕە لە کرمی ورد ورد. ژێرەوەشم یەك دونیای ترەقە تێدایە. لەسەر کورسیەکەی هەر سەر و خواری دەکرد، دیار بوو حاڵی زۆر باش نەبوو.

جۆرج وتی: نەنەگیان دوایی تێدەگەی ئەو دەرمانە سودی زۆری هەیە بۆ تۆ.

ئەو هاواری کرد: بەسودە؟ ئەو دەرمانە باشە بۆمن؟ خەریکە دەمکوژێت!

دوایی دەستی کرد بە ئەستور بوون.

هەر دەهات و ئەستورتر دەبوو!

فش دەبوو!

وەك ئەوەی یەکێك بای تێکات!

واتە ئێستا دەتەقیٚ؟

ڕەنگی دەموچاوی لە ئەرخەوانی بۆوە بە سەوز.

بەڵام سەبرکەن! شوێنێکی پەنچەر بوو! جۆرج دەیتوانی دەنگی هاتنە دەرەوەی هەوایەکە ببیسیٚ. ئەستور بوونی نەنکم راوەستا. بەرە بەرە لاواز و لاوازتر دەبوو، هەر خڕ و خڕتر دەبۆوە تا وەکو پێشتر بۆوە بە پیرێژنێکی رزیو و لێك بلاو.

جۆرج وتی: نەنەگیان چۆنی؟

هیچ وەڵامێك نەبوو.



دوایی شتێکی خۆش روویدا. جەستەی نەنکم لە ناکاو پێچێکی خوارد و لەسەر کورسیەکەی هەڵدرا و لەسەر دوو پێی لە نزیك فەرشەکە هاتەوە خوارێ.

جۆرج وتی: نەنە، زۆر باشە! ئەو هەموو ساڵانە نەتدەتوانی بەمشێوەیە راوەستی! سەیری خۆت بکە! لەسەر پێیەکانت وەستاوی و گۆچانیشت پێی نییە!

نەنکی هەر گوێشی لە دەنگی جۆرج نەبوو. چاوە زەق و سڕەکانی دیسان کەوتنەوە سەر جۆرج. ئەو سەدان کیلۆمەتر لەم دونیایە دوور بوو.

جۆرج بە خۆی وت: چ دەرمانێکی موعجیزاوی. بیری کردەوە چەند خۆش و سەرنجڕاکێشە لەوێ بوەستێ و ببینێ ئەو دەرمانە چی بەسەر نەنکی دێنێ. بەڵام لە ناکاو نیگەران بوو: ئەی دواتر چی؟



بەڵام یەکسەر نیگەرانیەکەی رەویەوە.

نەنکی لە ناکاو باڵای بەرز بوو.

یەکەم جار گەشە کردنەکەی هێواش بوو. تەنیا چەند سانتی مەترێك گەورە بوو... بڵندتر و بڵندتر بوو... هەر چەند چرکەساتێك دوو سانتم و نیو... جۆرج سەرەتا گوێی نەدایە.

بەڵام کاتێك باڵای بوو بە دوو مەتر، جۆرج خۆی هەڵدایە سەرەوە و هاواری کرد: هێی نەنە! خەریکە باڵات بەرز دەبێ! خەریکە گەورە دەبی! گوێ بگرە بەو ئەندازە بمێنەوە! باشترە لەوە بەرزتر نەبی چونکە سەرت بە سەقفەکە دەکەوێ!

بەڵام ئەنکی دیسان هەر بڵندتر دەبوو.

بەراستی دیمەنێکی جوان و سەرنجڕاکیش بوو. پیرێژنی رەق و لاواز بەردەوام بڵندتر و بڵندتر، و درێژ و درێژتر و لاواز و لاوازتر دەبوو. وەك ئەوەی پارچە جیرەیەك بێ کە بە دەستی نەبینراو رابکێشرێ.

لە کۆتاییدا کاتێك سەری بە سەقفەکە کەوت، جۆرج بیری کردەوە ئیتر ئەنکم جێی نییە تا بڵندتر ببێ.

بەڵام بەمشێوەیە نەبوو.



دەنگی قرچە قرچ هات و خشت و خۆڵ و وردە گێچ و چیمەنتۆ هاتە خوارێ.

نەنەگیان، وا باشترە ئیتر کۆتایی پێنێنی؟ باوکم تەنیا ئەو ژوورەی هەبوو کە ڕەنگ کرا بێ.

بەڵام ڕاوەستان لە گۆڕێ نەبوو.

هێندەی پێنەچوو سەر و شانەکانی نەنکم لە سەقفەکە هاتە درێ، بەمشێوەیە هەر درێژ و درێژتر دەبوو.

جۆرج بە پەلە لە قادرمەکانی ژووری نوستن ڕۆیشتە سەر و لەوێ دیتی کە نەنکی وەکو کارگ سەری لە کەفی ژوورەکە هاتۆتە دەرێ.



لە کۆتاییدا نەنکی دەنگی هاتەدەر و هاواری کرد: ئەی گیان! سپاس بۆ خوا کە من لێرەم!

جۆرج وتی: نەنەگیان ئارام بە!

ئەو هاواری کرد: ئۆۆۆۆۆی، خەریکی گەورە بوونم! سەیرکە چۆن باڵام بەرز دەبێ!

ئێرە ژووری منە. سەیری بکە چیت بەسەر هێناوە.

نەنکم قیژاندی: دەرمانێکی لەرادەبەدەرە. کەمێکی ترم بدەیە با بیخۆم!

جۆرج بیری کردەوە: دەڵێی تێکچووە!

نەنکی هاواری کرد: زووکە کوڕە! کەمێکی ترم لەو شروبە بدەیە! دەردت دەرمان دەکەم! گەشەکەم خەریکی کەم بوونەوەیە!

جۆرج هێشتاش هەر شوشە دەرمانەکەی لە دەستێکدا و کەوچکەکەشی لە دەستەکەی تری دابوو. بیری کردەوە وا باشترە ئەو کارە بکەم، بۆچی نا؟ لەبەر ئەوە کەوچکێکی تریشی لە زاری کرد.

نەنکی هاواری کرد: ئاخ و بە هەمان شێوە گەشەکەی بەردەوام بوو. لاقەکانی هەر لەسەر کەفی ژووری دانیشتن بوو بەڵام سەری بە خێرایی لە سەقفی ژووری نوستن نزیك دەبۆوە.

نەنکی بە جۆرجی وت: بەردەوام باڵام بەرز دەبێ، تەنیا سەیر بکە!

جۆرج هاواری کرد: ژووری بەیتونە لەسەر سەرتە، نەنەگیان دەرگای ویمان داخستووە! پڕ لە جرو جانەوەر!



سەری پیرێژن تەق بە سەقفەکە کەوت، وەك ئەوەی بە مادەیەکی نەرمدا رۆچوو بێ.

جۆرج لە ژووری نووستنەکەیدا راوەستا و سەیری ئەو بارودۆخە نالەبارەی دەکرد.

کونێکی گەورە لە کەفی ژوورەکە و یەکێکی تر لە سەقفەکەدا بوو و بەشی ناوەراستی لەشی نەنکم وەك کۆڵەکەیەك لە نێوان دوو کوناندا بوو. لاقەکانی لە نهۆمی خوارەوە و سەریشی لە ژووری بەیتونە بوو.

لە سەرەوە دەنگە گڕ و ناخۆشەکەی پیرێژن هات: من هەر بەرزتر دەبم، کەوچکێکی ترم شروب بدەیە کوڕە تا لە سەقفەکەش تێپەڕم!

جۆرج وەڵامی دایەوە: نا نەنەگیان، نا! تۆ هەموو ماڵەکەت وێران کرد!

نەنکی هاواری کرد: ماڵەکە بە جەهەننەم من پێویستم بە هەوای تازە هەیە!

بیست ساڵە لە ماڵێ نەچوومە دەر!

جۆرج بە خۆی وت: ئەی هاوار، خەریکە لە سەقفەکەش تێدەپەڕێ. هاتە نهۆمی خوارەوە و لە دەرگای پشتەوە چوو بۆ حەوشەکە. پێیوا بوو ئەگەر سەر بانەکەش خراپ بکات ئەوە زۆر ناخۆش دەبێ. باوکی بە دڵنیاییەوە توڕە دەبێ و هەموو شتێك بە مل جۆرج دادێنێ. چونکە بۆ خۆی دەرمانەکەی دروست کردبوو. بەشێکی زۆری لە دەرمانەکە دابوو بە نەنکی. جۆرج دەپاڕایەوە، نەنەگیان لە سەقفەکە مەچۆ دەر! تووخوا مەچۆ!

# مریشکی قاوەیی

جۆرج لە ناو حەوشەی مەزراکە راوەستابوو و سەیری سەر بانەکەی دەکرد. خانووە قەدیمیەکەی ناو مەزرا سەقفێکی جوانی هەبوو بە خشتەی سوور و دوکەڵکێشە بڵندەکەیەوە.

هیچ نیشانەیەك لە نەنکی نەبوو. تەنیا سەیرەیەك کە لەسەر دوکەڵ کێشەکە نیشتبوو و ئاوازی دەخوێند. جۆرج بیری کردەوە، پیرێژن بە ژووری بن بەیتونەکەوە نووساوە. و سپاسی خوای کرد.

لە ناکاو پارچە خشتەیەك لە سەقفەکە غلۆر بۆوە و کەوتە ناو حەوشە. سەیرەکەش خێرا باڵی لێدا و رایکرد.

دوایی خشتەیەکی تر.

دواتر شەش پارچەی تریش.

و دواتر شتێکی زۆر سەیر و سەمەر وەك دێوەزمەیەك کە لە ناو دەریا بێتە دەر. سەری نەنکم وردە وردە لە سەقفەکە هاتە دەرەوە...

هەروەها گەردنی رەق و باریك وەك قامیشی قلیان...

و دواتر شانەكانی...

نەنكم هاواری كرد: كورەكەم، بینیت چیم كرد! چۆنم سەقفەكە تێك و پێكدا!

جۆرج بە دەنگێكی بەرزەوە وتی: نەنەگیان، باش نییە ئیتر كۆتایی پێی بێنی؟

وەڵامی دایەوە: كۆتایی پێی بێنم! هەستێكی زۆر خۆشە! ئەدی من پێم نەوتبووی هێزی جادوییم هەیە! پێم وتبووی نووكی پەنجەكانم هێزی جادوویان هەیە! بەڵام تۆ بە قسەت نەكردم، وا نییە؟ تۆ هەر گوێت نەدا بە قسەی نەنكە پیرەكەت!



جۆرج له پشت سەریەوه هاواری کرد: نەنەگیان تۆ ئەو کارەت نەکردوه، من ئەو کارەم کرد! دەرمانێکی نوێم بۆ دروست کردی.

نەنکی قیژاندی: دەرمانی نویێ؟ تۆ؟ قسەی بێ مانا!

جۆرج هاواری کرد: بەڵێ من ئەو کارەم کرد! دەرمانێکی نوێم بۆ دروستکردی!

نەنکی نەڕاندی: وەك هەمیشە درۆ دەکەی! وەك هەمیشە!

من درۆ ناکەم، نەنەگیان سوێند دەخۆم درۆ ناکەم!

دەموچاوی پیر و چرچ و لۆچی لەسەرەوەی سەقفەکە بە شێوەیەکی گوماناوی لە جۆرجەوه رامابوو. هاواری کرد: واتە تۆ بۆ خۆت بە تەنیایی دەرمانێکی نوێت دروست کردووه؟

بەڵێ نەنە، بۆ خۆم دروستمکرد!

وەڵامی دایەوه: بڕوا ناکەم، بەڵام من لێرەوه زۆر ئاسودەم. پیاڵێکم چا بۆ بێنە.



لە نزیك ئەو شوێنەی جۆرجی لێ راوەستابوو مریشكێكی قاوەیی دانی دەخوارد. لەپڕ جۆرج بیرۆكەیەكی بە مێشكیدا هات. بە خێرایی سەرەی شوشە شروبەكەی هەڵگرت و كەمێكی لە كەوچكی كرد. جۆرج بە سەرسامیەوە وتی: نەنەگیان سەیری ئێرە بكە. دوولا هاتەوە و كەوچكەكەی لە پێش مریشكەكە راگرت.

جۆرج وتی: جیك جیك، جیك جیك، وەرە ئێرە، هەندێك لەوە بخۆ.

جوجەڵەكان باڵندەیەكی گێل و زۆریش نەوسنن. پێیان وایە هەموو زڕ و زبیلێك خواردنە. ئەویان پێی وابوو كەوچكەكە پڕە لە گەنمەشامی. زۆر خۆشحاڵ بوو. سەری سوڕاند و لە تەنیشتەوە سەیری كوچكەكەی كرد.

جۆرج وتی: وەرە، وەرە،جوجەڵە باشەكەم، جیك جیك، جیك جیك.

مریشكە قاوەیەكە ملی بۆ لای كوچكەكە درێژ كرد و دەنووكی لێدا. دەنووكی بە تەواوی تێڕاكرد. دەرمانەكە زۆر بە خێرایی كاریگەر بوو. دەنگێكی سەیر لە مریشكەكە هاتە دەر. ئۆی، راست وەك موشەك دەرپەڕی. جوجەڵەكە تا بەرزترین شوێنی ماڵەكە رۆیشتە سەر.



دووباره بەربۆوه ناو حەوشەکە، و بە پەڕە قیت بووەکانی لەوێ نیشت. سەر و سەکوتە گێل و نەزانەکەی جوجەڵەکە نیگایەکی سەرسامیانەی پێوە دیار بوو. جۆرج بۆ سەیر کردن راوەستا. نەنکیشی لە سەرەوەی سەقفەکە سەیری دەکردن. مریشکەکە لەسەر پێیەکانی وەستا. تا رادەیەك دەلەرزی. دەنگی خوڕە خوڕێکی سەیری لە گەروی دەهات. دەنووکی دەکرایەوە و دادەخرایەوە. وا دەهاتە بەرچاو کە بەڕاستی نەخۆشە.

نەنکی هاواری کرد: کوڕی نەزان و گێل چیت کرد! خەریکە دەیکوژی! باوکت دەردت دەرمان دەکات!

لە ناکاو، دوکەڵێکی رەش لە دەنووکی مریشکەکە هاتە دەر.

نەنکی هاواری کرد: ئاگر! مریشکەکە سوتا!

جۆرج رایکرد تا سەتڵێك ئاو بێنێ.



مریشکەکە خەریکە دەبێتە کەباب بۆ خواردن!

جۆرج سەتڵە ئاوەکەی بە مریشکەکە داکرد و دەنگی فشە فشی لێهات و دوکەڵەکە تەواو بوو.



نەنکی هاواری کرد: مریشکە پیرەکە دوایین هێلکەی کرد! مریشکەکان دوای ئەوەی ئاگریان گرت ئیتر هێلکە ناکەنەوە.

ئاگرەکە کوژایەوە، پێدەچوو مریشکەکە حاڵی باشتر بووبێ. راوەستا. باڵەکانی لێکدا. دوایی خۆی خوار کردەوە بۆ لای زەوی، بە شێوەیەك کە ئامادەی فڕین بوو. فڕی. فڕی بۆ ئاسمان و چەرخێکی لێدا و دووبارە هاتەوە خوارێ و



لەسەر دوو پێیەکانی راوەستا.

نەنە لەسەردەوەی سەقفەکە هاواری کرد: مریشکی سیرکە! تەناف بازێکی هیچ و پوچە! هەمان کات مریشکەکە دەستی کرد بە گەورە بوون.



جۆرج چاوەڕەوانی ئەو ڕووداوە بوو. قیژاندی: خەریکە گەورە دەبێ! نەنەگیان سەیرکە خەریکە گەورە دەبێ، سەیری بکە خەریکە گەورە دەبێ!

مریشکەکە گەورە و گەورەتر دەبوو... بڵندتر و بڵندتر... و بە خێرایی چوار پێنج ئەوەندەی ئەندازەی سروشتی خۆی لێهات.

جۆرج هاواری کرد: نەنە، دەیبینی؟!

پیرێژن قیژاندی: ئا. کوڕە دەیبینم! ئەوە سەیری دەکەم!

جۆرج لە سەرسامیان خۆی بە پێوە ڕانەدەگرت، ئیشارەتی بۆ مریشکەکە کرد و وتی: کاریگەری دەرمانی ئەفسوناوی بوو، ڕێك وەك تۆ گەورە بوو!

بەلاّم گەورە بوونی ئەو دووانە جیاوازیەکی هەبوو. کاتێك نەنکی گەورە و گەورەتر بوو، لاوازتر و لاوازتریش بوو بەلاّم مریشکەکە بەمشێوەیە نەبوو. و هەر قەلّەو و قەلّەوتر مایەوە.

زۆر خێرا لە جۆرجیش گەورەتر بوو، بەلاّم بالاّی بەمشێوەیە نەمایەوە. ئەوەندە گەورە ببوو کە بە ئەندازەی ئەسپێکی لێهات. نەنەگیان، لەرادەبەدەر نییە؟

نەنکی وەلاّمی دایەوە: ئەو مریشکە بە ئەندازەی من گەورە نەبووە! لە بەرامبەر من زۆر وردیلەیە! من لە هەموویان بلّندترم!



# بەرازەکان، گوڵکە نێرەکان، مەڕەکان، ئەسپە وردیلەکان، بزنە مێیەکان:

لەهەمان کات دایکی جۆرج کە بۆ شت کڕین رۆیشتبوو بۆ لادێیەکە، گەڕایەوە. ئۆتۆمبێلەکەی لە حەوشە راگرت و لێی هاتە دەر. بە شوشەیەك لە دەستێکدا و جانتایەکیش خواردەمەنی لە دەستەکەی تریدا هاتەوە.

یەکەم شت کە بینی مریشکێکی قاوەیی و زەبەلاح بوو کە لە پێش جۆرجی بچووك راوەستابوو. شوشە شیرەکەی لێ بەربۆوە.

دوایی نەنکی لەسەربانیەوە دەستی کرد بە قاو و قیژ کردن و کاتێك دایکی سەری بڵند کرد و چاوی بە سەری نەنکی جۆرج کەوت کە گەیشتبوو دوکەڵکێشەکە، جانتای خواردەمەنیەکەشی لێ بەربۆوە.

نەنکی هاواری کرد: ماری پێت چۆنە؟ گرەو دەکەم تا ئێستا مریشکی وا گەورەت نەبینیوە! مریشکی زەبەلاحی جۆرجە ئیتر!

دایکی جۆرج لە کاتێکدا زمانی بۆ نەدەگەڕا وتی: بەڵام... بەڵام... بەڵام.

نەنکی جۆرج هاواری کرد: کاریگەری دەرمانی ئەفسوناوی جۆرجە! هەردووکمان لێمان خواردۆتەوە. ئەو مریشکە و منیش!

دایکی جۆرج هاواری کرد: بەڵام چی روویداوە سەرت گەیشتۆتە ئەوێ؟

پیرێژن قاقا پێکەنی: نازانم! پێیەکانم هێشتا لەسەر ئەرز و لە ژووری دانیشتنە!

دایکی جۆرج لە مەسەلەکە نەدەگەیشت. لە سەرسامیانەوە رەق ببوو. هێندەی نەمابوو لە هۆش خۆی بچێ.

چەند چرکەساتی تر، باوکی جۆرج واتە بەرێز ***کیلی کرانکی*** گەیشتەوە. بەرێز کرانکی پیاوێکی ورد و بچووك بوو و پێیەکانی چەنبەری[٣] و سەرێکی گەورەی هەبوو. باوکێکی میهرەبان بوو بۆ جۆرج بەڵام ژیان لەگەڵی زۆر ئاسان نەبوو، چونکە بە بچووکترین شت خوێنی دەکوڵی و تورە دەبوو. مریشك لە ناو حەوشە بەو شکل و شیوەیەوە بەدڵنیاییەوە مەسەلەیەکی کەم نەبوو و کاتێك بەرێز کرانکی ئەوی بینی بە جۆرێك هەڵدرایە سەرەوە وەك ئەوەی لە ژێر پێیەکانی ئاگر کرابێتەوە.

---

٣ - پێ چەنبەری: نەخۆشیەکی سك ماکیە لە ژێر پێیەکان کە دەبێتە هۆی ئەوەی پێیەکان خڕ بن یا بنوشتێنەوە، و پێیەکان وەك کوتکیان لێ دێ.



دەستەکانی راوەشاند و هاواری کرد: خوایە گیان! ئەوە چییە؟ چی بووە؟ ئەو بوونەوەرە لە کوێوە هاتووە؟ مریشکێکی زەبەلاح! کێ ئەو کارەی کردووە؟

جۆرج وتی: من کردم.

نەنکی لە سەربانیەوە هاواری کرد: سەیری من بکە! مریشك خۆ گرنگ نییە! من چیم بەسەر هاتووە؟

بەرێز کرانکی سەری بەرز کردەوە و نەنکی جۆرجی بینی. وتی: تۆ بێدەنگ بە! دیار بوو بە بینینی پیرێژن لە سەربانی هیچ سەرسام نەبوو. ئەو بە بینینی مریشکەکە سەرسام ببوو. هیچ کات شتێکی ئەوهای نەبینیبوو. ئەرێ کەس شتی وای بینیوە؟

بەرێز کرانکی لەگەڵ سەما کردن هاواری کرد: لەرادەبەدەرە! مەعجیزەیە! جۆرج چۆنت ئەو کارە کرد؟

جۆرج هەندێك شتی سەبارەت بەو دەرمانە بە باوکی وت. لە کاتێکدا کارەکەی بۆ باوکی شیدەکردەوە، مریشکە قاوەی و زەبەلاحەکە لە ناوەراستی حەوشەکە دانیشت و دەستی کرد بە گارە گار....



هەموو سەیریان دەکرد.

کاتێك دووبارە هەستایەوە. هێلکەیەکی قاوەیی لەوێ بوو. هێلکەکە بە ئەندازەی تۆپێکی یاری کردن(تۆپی پێ) بوو.

بەرێز کرانکی وتی: ئەو هێلکەیە، هێلکەو رۆنێکی تەواوی بۆ بیست کەس پێی دروست دەکرێ.



جۆرج چەندت لەو دەرمانە دروست کردووە؟

زۆرم دروست کردووە. مەنجەڵێك لە چێشتخانەیە و ئەو شوشە پڕەش لێرەیە.

بەڕێز کرانکی باسکی جۆرجی گرت و هاواری کرد: وەرە لەگەڵم. دەرمانەکەش بێنە! چەند ساڵە دەمەوێ ئاژەڵی گەورەتر بەخێو بکەم. گۆلکی نێر و گەورە و دابەستە هەروەها مەڕی گەورە و قەڵەو بۆ گۆشتەکەیان...

ئەوان یەکەم جار ڕۆیشتن بۆ تەویلەکە.

جۆرج کەوچکێکی لەو دەرمانە دا بە ئاژەڵەکە.

لە لوتی ئاژەڵەکە دوکەڵێك هاتە دەر و هەڵدرایە سەرێ. دوایی دەستی کرد بە گەورە بوون.



دوایی چوو بۆ لای گۆلکە نێرەکان کە بەرێز کرانکی هەوڵی دەدا بۆ فرۆشتن قەڵەویان بکات. جۆرج بە هەر یەکەیان هەندیکی لەو دەرمانە دا و ئەوەی لە ناو وێنەکەدا دەبینن روویدا.

دوایی مەڕەکان



هەندێکیشی لەو دەرمانەی دا بە ئەسپە وردیلە و خۆڵەمێشیەکەی، ***جەك فراست***.

لە کۆتاییدا، بۆ پێکەنین کەمێکیشی، بە بزنە وردیلەکەیان، ئاڵما دا.



# سلینگ بۆ نەنکم

نەنکم لە بەرزترین شوێنی سەقفەکە دەیتوانی هەموو شتێك بە باشی ببینێ. بەڵام بە بینینی ئەو شتانە دڵخۆش نەبوو. دەیویست سەرنجی هەمووان بۆ لای خۆی رابکێشێ بەڵام هیچ کەس گرنگی پێنەدەدا. جۆرج و بەرێز کرانکی کە بە بینینی ئاژەڵە زەبەلاحەکانیان لەرادەبەدەر خۆشحاڵ بوون، بەردەوام لە هاتوچۆ دابوون. خانمی کرانکی لە چێشتخانەکە خەریکی شت و شۆر بوو و نەنکیشم لەسەرەوە بە تەنیا مابۆوە.

نەنکم هاواری کرد، هێی! لەگەڵ تۆمە! جۆرج! هەر ئێستاکە برۆ و پیاڵە چایەکم بۆ بێنە، وەك ئاژەڵان تەنیا دەخۆی و دەخەوی!

بەرێز کرانکی وتی: بە قسەی ئەو بزنە پیرە مەکە، ئەو لەسەر هەموو شتێك بەزمێك دەگێرێ، جێگاکەی عەیبی نییە و زۆر باشە.

جۆرج وتی: باوکە، بەڵام ئێمە نابێ رێگە بدەین لەوێ بمێنێتەوە، ئەی ئەگەر باران باری؟

نەنکم قیژاندی: جۆرج! بەڕاستی منداڵێکی هیچ و پوچی! وەکو کرمێکی بچووك مرۆڤ بێزار دەکەی! خێرا پیاڵە چایەك و پارچە کێکی کشمیشدارم بۆ بێنە!

جۆرج وتی: باوکە ئێمە ناچارین بیهێنینە خوارێ. ناهێڵێ بە ئارامی کارەکەمان ئەنجام بدەین.

خانمی کرانکی هاتە دەرەوە و وتی: لەگەڵ جۆرج هاوڕام. ئەو دایکی منە.

بەرێز کرانکی وتی: ملی دێشێ!

خانمی کرانکی وتی: دەبێ شتێك بکەین، من ناتوانم بێڵم دایکم تا کۆتایی ژیانی لەو سەرەوە بمێنێتەوە.

لە کۆتاییدا بەرێز کرانکی تەلەفۆنی بۆ کۆمپانیای بە کرێدانی سلینگ کرد و داوای لێکردن بە زووترین کات گەورەترین سلینگیان بۆ بنێرێ.

کاتژمێرێك دواتر سلینگەکە گەیشت. سلینگەکە تایەی لە بن بوون و دوو کەسیشی لە ناو بوو.



شۆفێرەکان سلینگەکەیان تا سەقفەکە بردە سەرێ و تەنافیان لە بن هەنگلی نەنکی جۆرج بەست. دوایی لە ناو سەقفەکەیان هێنایە دەرەوە.

هەر چۆنێك بێ، دەرمانەکان نەنەیان چاك کردبۆوە. بەڵام بەد رەوشتیەکەی کەم نەببۆوە، پێدەچوو ئازارەکانی نەمابێ و لە ناکاو وەك مشکیکی بزۆز و شەیتانی لێ هاتبوو. هەر کە سلینگەکە لەسەر ئەرزی دانا رایکرد بۆ لای ئەسپە زەبەلاحەکەی جۆرج واتە جەك فراست و خۆی هەڵدایە سەر پشتی.

بالای پیرێژنە پیر و تێکشکاوەکە ئێستا بە بڵندی خانوویەك بوو، ئەسپەکەی بە چوار ناڵی بۆ لای مەزراکە دەبرد و بەو شێوەیەی کە بەسەر دەرختەکان و مەخزەنەکاندا تێپەڕ دەبوو هاواری دەکرد: لەسەر رێگەم لاچن! رێگەم بۆ چۆل

بکەن! ئەی وردیلە داماوەکان یان خۆ لادەن، یان لە ژێر پێی پلّچ و پانتان دەکەمەوە تا بمرن! و هەندێك شتی بیّ مانای تر.

بەڵام چۆنکە نەنکم زۆر بلّند ببوو و نەیدەتوانی بچێتەوە ناو مالّێ، ناچار بوو ئەو شەوەی لە ناو مەخزەن و لەگەڵ مشکەکان بەسەر بەریّ.

# پلانی گرنگی بەرێز کرانکی

بەیانی رۆژی دواتر، باوکی جۆرج بە زەوق و شەوقەوە بۆ خواردنی نانی بەیانی هاتە خوارێ. ئەو بە دەنگێکی بەرزەوە وتی: تا بەیانی بە خەبەر بووم و لەبارەی ئەوەدا بیرم کردۆتەوە.

جۆرج پرسی: لەبارەی چی؟

خۆ دیارە، لەبارەی دەرمانە ئەفسوناویەکەی تۆ! ئیتر ناتوانین سەبر بکەین! ئێمە دەبێ دەرمانی زیاتر دروست بکەین! زۆر یەکجار زۆر!

مەنجەڵە گەورەکە رۆژی دواتر بە تەواوی بەتاڵ ببوو چونکە ژمارەیەکی زۆر لە مەڕەکان و مانگایەکان و گۆلکەکان لێیان خواردبۆوە.

جۆرج پرسی: باوکە، بۆ چی پێویستیمان بە برێکی زۆر هەیە. ئێمە خۆ ئەو دەرمانەمان بە هەموو ئاژەڵەکان داوە و کارێکی وامان کردووە نەنکم وەکو مشکێکی بزۆز و شەیتانی لێ بێ و تەنانەت ناچار بێ شەو لەگەڵ مشکان لە ناو مەخزەنەکەدا بخەوێ.

بەرێز کیلی کرانکی هاواری کرد: کوڕی باشم، ئێمە هەزاران بەرمیلمان لەو مادەیە پێویستە! چەندین تەن! دواتر دەتوانین بە هەر جوتیاریکی پێمان خۆش بوو بیفرۆشین و دوایی هەموویان ئاژەڵی زەبەلاحیان دەبیٚ! ئێمە کارخانەیەکی گەورەی دەرمانی ئەفسوناوی دروست دەکەین و بەرهەمەکانیشی هەر شوشەی بە ٥ پاون دەفرۆشین. ئێمە دەوڵەمەند دەبین و تۆش ناو بانگ پەیدا دەکەی.

جۆرج وتی: بەڵام باوکە، خولەکێك سەبر بگرە.

بەرێز کرانکی کە خەریکی لێدانی رۆنە کەرە بوو لەسەر نانی بەیانی کە لەگەڵ قاوە دەیخوارد وتی: تۆ نازانی ئەو داهێنانە گەورەی تۆ جیهانی دەبیٚ! ئیتر هیچ کەس برسی نابیٚ!

جۆرج پرسی: بۆچی برسی نابن؟

بەرێز کرانکی لە کاتێکدا دەستی رادەوەشاند هاواری کرد: چونکە مانگایەکی گەورە لە رۆژێکدا پەنجاە سەتڵی شیر هەیە. جوجکەیەکی زەبەلاح بە ئەندازەی سەت جوجکەی سوور بووە گۆشتی هەیە و یەك ئاژەڵی قەڵەو دەتوانیٚ هەزار پارچە گۆشتی گەورە بدات بە تۆ! لە رادەبەدەرە، کوڕەکەم! بیٚ وێنەیە! ئەو دەرمانە دونیای سەراو بن دەکات.



جۆرج دووبارەی کردەوە: بەڵام باوکە سەبر بگرە.

بەڕێز کرانکی وتی: ئیتر گوێم لە سەبر بگرە نەبێتەوە؟ تەنانەت نابێ یەك چرکەش ڕاوەستین! ئێمە دەبێ یەکسەر دەست پێبکەین!

خانمی کرانکی لەو سەری مێزەکەوە وتی: ئازیزم، ئارام بە! و ئەوەندەی تام و خوێ لێ مەدە!

بەڕێز کرانکی لە کاتی هەستان لەسەر کورسیەکەی هاواری کرد: بە جەهەننەم! خێراکە جۆرج! دەی با بڕۆین! یەکەم کار کە دەبێ ئەنجامی بدەین ئەوەیە مەنجەڵێك لەو مادەیە بۆ نموونە دروست بکەین.

جۆرج بە ئارامی وتی: بەڵام باوکە، مەسەلەکە ئەوەیە کە...

بەرێز کرانکی بە دەنگێکی بەرزەوە وتی: هیچ مەسەلەیەك بوونی نییە. چۆن دەبێ مەسەلە بوونی هەبێ ؟ تەواوی ئەو کارەی کە تۆ دەبێ بیکەی ئەوەیە هەموو ئەو شتانەی دوێنێ لە ناو مەنجەلەکەت کردوون ئەمڕۆش تێیان بکەی. و لەو کاتەی کە تۆ ئەو کارە ئەنجام دەدەی منیش هەموو ئەو شتانەی تێیان دەکەی دەیانووسم. بەمشێوەیە ئێمەش بە یاسای جادوویی خۆمان دەگەین!

جۆرج بەردەوام بوو: بەڵام، باوکە! تکات لێ دەکەم گوێم لێ بگرە!

خانمی کرانکی وتی: بۆچی گوێی لێ ناگری، ئەو دەیەوێ شتێکت پێی بڵێ.

بەڵام بەرێز کرانکی ئەوندە بە شەوق و زەوق ببوو نەیدەتوانی جگە لە خۆی گوێی لە کەس بگرێ. دوایی بە دەنگێکی بەرز بەردەوام بوو: کاتێك دەرمانە نوێیەکە ئامادە بوو، ئێمە لەسەر مریشکە پیرەکە تاقی دەکەینەوە. تەنیا لەبەر ئەوەی دڵنیا بین کە بە باشی دروستمان کردووە و دوای ئەوە هەموومان هاوارێکی خۆشی دەکێشین و کارخانەیەکی گەورە دروست دەکەین.

بەڵام باوکە...

دەی با بڕۆین، دەتەوێ چی بڵێی؟

جۆرج وتی: لەوانەیە هەموو ئەو شتانەم لە یاد نەمابێ کە بۆ دروستکردنی ئەو مادەیە بە کارم هێناون.

بەڕێز کرانکی هاواری کرد: بە دڵنیاییەوە وەبیرت دێتەوە، تۆ دەتوانی کوڕەکەم. منیش یارمەتیت دەدەم! من وەبیرت دێنمەوە! لە کۆتاییدا دەیبینی! بیبینین، یەکەم جار چیت تێکرد؟

لە پێش هەموو شتێکدا چووم بۆ حەمام. لەوێ شتی زۆرم بە کار هێنا و هەروەها شتەکانی جوانکاری دایکم.

بەڕێز کرانکی وتی: ئەگەر وایە دەی بابڕۆین! یەکەم جار دەچین بۆ حەمام!

کاتێك گەیشتنە ئەوێ یەك دنیا شوشە و سپرای بەتاڵیان دۆزیەوە، بەڕێز کرانکی وتی: زۆر باشە! ئەوانە پیمان نیشان دەدەن کە چ شتێکت بە کار هێناوە! ئەگەر شتێك بەتاڵ بوو ئەوە دیارە تۆ بە کارت هێناوە!

لەبەر ئەوە بەڕێز کرانکی دەستی کرد بە دروستکردنی لیستیك لەو شوشە و سپرا و ئەو شتانەی بەتاڵ کرابوون لە ناو حەمام. دوایی چوون بۆ لای مێزی توالتی خانمی کرانکی. بەڕێز کرانکی وتی: یەك بەستە بۆدرە و نووسی.... جێڵی هێلگا. بوونی شەلغەم. لەرادەبەددەرە. بە باشی دەچێتە پێش. دوایی چووی بۆ کوێ؟

شوێنی جل شوشتن. بەڵام باوکە دڵنیایی لێرە هیچت لە بیر نەچووە؟



ئەوە تۆی کە نابێ هیچت لە بیر بچێتەوە، وا نییە؟

بۆچی، وایە. لەبەر ئەوە چوون بۆ شوێنی جل شوشتن و بەرێز کرانکی دیسان ناوی شوشە و مەقەبا بەتاڵەکانی نووسیەوە و هاواری کرد: ئەی خوایە گیان، چ شتێکت بە کار هێناوە؟ واتە ئەو دەرمانە جادوویە لەو شتانە دروست بووە! ئایا ئەوە هەموویەتی؟

نا باوکە، هەمووی نییە. و باوکی بردە ناو مەخزەنەکە تا پێنج شوشەی بەتاڵی ناو قەفەزەکەی نیشان بدات. بەرێز کرانکی ناوی هەموویانی نووسی.

هیچی تر نییە؟

جۆرجی بچووک سەری خوراند و بیری کردەوە بەڵام نەیتوانی هیچی تر وەبیر خۆی بێنێتەوە تا بینووسێ.

بەرێز کیلی کرانکی خۆی هەڵدایە ناو ئۆتۆمبێلەکە و چوو بۆ لادێیەکە و ئەو شتانەی کڕی کە کە لە ناو لیستەکەدا نووسرا بوون.



دوایی چوو بۆ لای ڤێتەرنەری و هەندێك لەو دەرمانە نوێیانەی تایبەت بە ئاژەڵان کڕی کە جۆرج بە کاری هێنابوون.

و بە جۆرجی وت: زووکە پێم بڵێ چیت کرد. بە وردی نیشانم بدە چۆناو چۆن تێکەڵت کردن.

# دەرمانی ئەفسوناوی ژمارە ٢

ئەوان لە ناو چێشتخانە بوون و مەنجەڵێکی گەورەش لەسەر تەباخەکە بوو. هەموو ئەو شتانەی بەرێز کرانکی کڕیبوونی لە تەنیشت مەغسەلەکەیان ریز کردن.

بەرێز کرانکی هاواری کرد: کوڕەکەم، خێراکە وەرە! یەکەم جار کامەت تێکرد؟

جۆرج وتی: ئەوەیان، شامپۆ و جێڵی زیڕی. باوکی شوشەکەی لە ناو مەنجەڵەکەدا بەتاڵ کرد.

جۆرج بەردەوام بوو: ئێستاش مەعجونی ددان و دواییش کەفی دەموچاو... و کرێمی دەموچاو... و بۆیەی نینۆك...

بەرێز کرانکی کە لە ناو چێشتخانەدا سەمای دەکرد هاواری کرد: کوڕەکەم، دەست پێبکە! ئەوانەی تێکە! کات بە فیڕۆ مەدە! رامەوەستە! دوودڵ مەبە! کوڕەکەم، بێ وینەیە، چەند خۆشە کاتێك دەبینم کار دەکەی!

جۆرج شتەکانی یەك لە دوای یەك لە ناو مەنجەڵەکە بە سەر یەکدا دەکردن چونکە شتەکانی لەبەر دەستدا بوو، کارەکەی لە دە خولەك زیاتر درێژەی نەکێشا.
بەڵام کاتێك تەواو بوو، ئەو شتانەی ناو مەنجەڵەکە وەکو جاری پێشوو نەبوو.

بەرێز کرانکی هاواری کرد: ئێستا دەبێ چی بکەی؟ دەبێ تێکەڵی کەین؟

یەکەم جار کوڵاندم، بەڵام زۆر نا و هەروەها لێکیشمدا.

بەرێز کرانکی تەباخەکەی هەڵکرد و جۆرجیش بە هەمان کەوچکە دارەکەی پێشوو دەستی کرد بە تێکوەردان. جۆرج وتی: بە ئەندازەی پێویست قاوەیی نەبوە. کەمێك سەبرکە! شتێکم لە بیر چۆتەوە!

بەرێز کرانکی هاواری کرد: چی! خێراکە، بڵێ! چونکە ئەگەر تەنیا شتێکی بچووکیشت لە یاد کردبێ دەرمانەکە دروست نابێ! لانی کەم وەك جاری پێشوو نابێ.

یەك لەسەر چواری رەنگی پلاستیکی قاوەییم لە بیر کردووە.

بەرێز کرانکی وەك تیر لە جێی خۆی دەرپەڕی و سواری ئۆتۆمبێلەکەی بوو و بە خێرایی رۆیشت بۆ ناو لادێیەکە و رەنگەکەی کڕی و بە هەمان خێرایی گەڕایەوە. لە چێشتخانە سەری رەنگەکەی کردەوە و دایە دەست جۆرج. جۆرجیش رەنگەکەی لە ناو مەنجەڵەکە کرد.

ئەوەتا، دروست بوو، رەنگەکەی رووناکتر بۆوە.

بەرێز کرانکی هاواری کرد: خەریکی قوڵتە قوڵتە. جۆرج! دەکوڵێ! ئامادەیە!

بەڵێ ئامادەیە. هیوادارم.

بەرێز کرانکیش کە زۆر بە هیوا بوو بە بڵندی وتی: بیّ وێنەیە! با تاقی بکەمەوە! ئێستا کەمێکی لێ بدەین بە جوجکەکە.

خانمی کرانکی لەو کاتەی کە دەهات بۆ لای چێشتخانەکە وتی: ئەی هاوار، بۆچی کەمێك ئارام ناگرن؟

بەرێز کرانکی هاواری کرد: ئارام بین؟ دەتەوێ ئارام بم لە کاتێکدا گرنگترین دەرمان کە تا ئێستا لە جیهاندا دروست نەکراوە، دروست دەکەین! جۆرج، بجوڵێ! کوپێکی پڕ لە مەعجونی ناو مەنجەڵەکە هەڵگرە، کەوچکێکیش بێنە هەندێکی لێ بدەین بە جوجکەکە تا بە تەواوی دڵنیا بین ئەو مەعجونەی دروستمان کردووە رێك ئەو شتەیە کە دەمانەوێ.

لە دەرەوەی حەوشە چەند مریشکێکی لێ بوون کە دەرمانی ئەفسوناویان نخواردبۆوە. ئەوان دەنوکیان لە هەموو شتێکی پیس دەدا.

جۆرج دوولا هاتەوە و کەوچکێکی دەرمانی ئەفسوناوی ژمارە دوو لە پێش جوجکەکە راگرت، وەرە... وەرە پێشێ مریشکی نازدار. قود قود... قود قود...



مریشکە سپی و بەڵەکەکە هات بۆ لای کەوچکی جۆرج و دەنوکی لێدا. ئەو کاریگەریەی کە دەرمانی ئەفسوناوی ژمارە دوو لەسەر جوجکەکەی دانا هەمان کاریگەری نەبوو کە دەرمانە ئەفسوناویەکەی ژمارە یەك دایبوو، بەلام زۆر سەیر بوو. جوجکەکە دەنگێکی لە خۆی دەرهێنا و لەرزی و بە ئەندازەی دوو مەتر بۆ هەوا هەڵدرا و بەربۆوە. دوایی بریسکەی زەردی کاڵ وەکو بڵێسەی ئاگر لە دەنووکی هاتە دەر وەك ئەو کاتەی کە دەمانەوێ چەقۆ تیژ بکەینەوە. دوایی پێیەکانی درێژ بوو و ئەندامەکانی تری لەشی وەك خۆی مایەوە. بەڵام پێیە لاواز و زەردەکانی درێژ و درێژتر... بوو و هەر درێژتر دەبوو...

بەرێز کیلی کرانکی هاواری کرد: چی بووە؟

جۆرج وتی: بەدڵنیاییەوە هەڵەیەك روویداوە!

پێیەکانی جوجکەکە هەر لە گەشە کردن دابوو و بڵند و بڵندتر دەبوو و لەشیشی لە هەوادا مابۆوە. کاتێك درێژی پێیەکانی گەیشتە پێنج سانتیمەتر،

گەشەکەی راوەستا، جوجکەکە بەو پێیە درێژ و بڵندانە زۆر ناشیرن و پێکەنیندار ببوو و وەك ئەوەی بەو لەشە بچووکە لەو سەرەوە دانیشتبێ. وەك ئەوەی جوجکەیەك لەسەر کورسیەکی هەوایی دانیشتبێ.

بەرێز کیلی کرانکی هاواری کرد: یا مەریەمی پاك و پیرۆز! ئێمە هەڵەمان کرد!



ئەوە بە کەڵکی هیچ نایەت! هەموو هەر پێیە! هیچ کەس پێی مریشکی ناوێ!

جۆرج وتی: بەدڵنیاییەوە شتێکم لە بیر چووە!

بەرێز کرانکی هاواری کرد: دەزانم شتێکت لە بیر چووە! بیر بکەوە، کوڕە، بیر بکەوە! چیت لە بیر چووە؟

جۆرج وتی: ئەها وەبیرم هاتەوە!

خێراکە، چی بوو؟

بۆدرەی کێچ بۆ سەگەکان.

مەبەستت ئەوەیە یەکەم جار بۆدرەکەت تێکردووە؟

بەڵێ باوکە. ئەو کارەم کرد. تەواوی بەستەکەم تێکرد.

و دواتر دەرمانەکە دروست بوو؟

جۆرج وتی: خولەکێك سەبرکە ئایا بۆیاغی قاوەییشمان لە ناو لیستەکەدا هەبوو؟

نا، نەبوو.

جۆرج وتی: لەوەیشم تێکرد.

باشە، ئەگەر وایە جێی سەرسوڕمان نییە کە دەرمانەکە بە باشی دروست نەبوو. بە خێرایی سواری ئۆتۆمبیلەکە بوو و ڕۆیشت بۆ لادێیەکە و ڕێژەیەکی زۆری بۆدرەی کێچ و بۆیاغی پێڵاو کڕی.

# دەرمانی ئەفسوناوی ژمارە ٣

بەرێز کیلی کرانکی لە کاتی راکردن بۆ چێشتخانە هاواری کرد: ئەوەش بەستەیەك بۆدرەی کێچ بۆ سەگەکان و یەك قوتوش بۆیاغی قاوەیی!

جۆرج بۆدرەی کێچی لە مەنجەڵەکە کرد. دواییش بۆیاغەکەی دەرهێنا و کردیە ناو مەنجەڵەکە.

بەرێز کرانکی قیژاندی، جۆرج بە باشی لێکیدە! با قوڵتێکی دیکەش بدات! ئەو جارەی ئەو شتەی دەمانەوێ بە دەستی دێنین! گرەو دەکەم!

دوای ئەوەی دەرمانی ئەفسوناوی ژمارە سێ کوڵیی و لێکدرا، جۆرج کوپێکی لێ پڕ کرد و چوو بۆ حەوشە تا لەسەر جوجکەیەکی تر تاقی بکاتەوە. بەرێز کرانکی بە دوای کەوت. و لە کاتێکدا بە خۆشی دەستەکانی لێکدەخشاند و هیوادار بوو، بانگی خانمی کرانکی کرد و وتی: وەرە سەیری ئەوەیان بکە! وەرە و ببینە کە چۆن ئێمە جوجکەیەکی ئاسایی دەکەین بە جوجکەیەکی زەبەلاح تا بتوانێ هێلکەی گەورە بکات بە ئەندازەی تۆپی یاری فدبۆڵ!

خانمی کرانکی لە کاتی راکردن بە دوایدا وتی: هیوادارم ئەو جارەیان باشتر بێ لە جاری پێشوو!

جۆرج لە کاتێکدا کەوچکێکی لە دەرمانی ژمارە سێ بە دەستەوە بوو وتی: وەرە جوجەڵەکە... وەرە... جیك جیك، ئافەرین جوجەڵەی باش... وەرە، وەرە... کەمێك لەو دەرمانە خۆشە بخۆ.

کەڵەشێرێکی رەشی زۆر جوان بە پۆپڕەی سووردەوە هات بۆ لای. سەیری کەوچکەکەی کرد و دەنوکی لێدا.

کەڵەشێرەکە دەنگێکی لێهات. قوقولی قوقو... هەڵدرایە هەوا و دووبارە بەربۆوە سەر ئەرزی.

بەرێز کرانکی هاواری کرد: سەیریکەن! خەریکە گەورە دەبێ. وردە وردە گەورە و گەورەتر دەبێ!

بەرێز کرانکی و خانمەکەی لەگەڵ جۆرج لە ناو حەوشە راوەستابوون و سەیری کەڵەشێرەکەیان دەکرد. کەڵەشێرەکە راوەستا. وا دیار بوو سەری دێشا.



خانمی کرانکی وتی: گەردنی چی بەسەر هات؟

جۆرج وتی: خەریکە درێژ دەبیٚ!

خانمی کرانکی وتی: دەمەویٚ ئەوە بلّێم، خەریکە درێژ دەبیٚ.

بەرێز کرانکی ئەو جارەیان، بۆ یەکەم جار هیچی نەوت.

خانمی کرانکی وتی: جاری پێشوو پێیەکانی مریشکەکە درێژ دەبوو ئێستا گەردنی. چ کەسێك جوجەڵەی مل درێژی دەوێ. خۆ کەس ناتوانێ ملی مریشك بخوات.



دیمەنێکی سەیر و سەمەر بوو. لەشی کەڵەشێرەکە هیچ گەشەیەکی نەکردبوو. بەڵام درێژی گەردنی دەگەیشتە دوو مەتر.

بەرێز کرانکی وتی: زۆر باشە، جۆرج، ئەو جارەیان چیت لە بیر چووە؟

نازانم.

بە دڵنیاییەوە دەزانی. دەی. کەمێك بیر بکەوە. لەوانەیە تەنیا شتێکی زۆر گرنگ هەبێ کە تۆ لە بیرت کردووە.



هەندێکیشم رۆنی ماتۆڕی تێکرد. لە ناو لیستەکەدا نووسیبووت؟

بەرێز کرانکی هاواری کرد: ئۆۆۆی، گیانەکەم! وەڵامەکەی ئەوەیە! چەندت تێکرد؟

نزیکەی نیو لیتر.

بەرێز کرانکی چوو بۆ لای گەراج و نیوەکەی تری رۆنەکەی دۆزیەوە. جۆرج بە دەنگێکی بەرزەوە وتی: کەمێکیش دژە بەستن. هەندێکیشم دژە بەستن تێکرد.

# دەرمانی ئەفسوناوی ژمارە ٤

جۆرج دووبارە لەگەڵ باوکی کە بە تورەییەوە سەیری دەکرد گەڕایەوە بۆ چێشتخانە، عەیارەیەك رۆن ماتۆڕ و کەمێکیشی دژە بەستن کردە ناو مەنجەڵەکە.

بەرێز کرانکی هاواری کرد: لێی گەڕێ دووبارە بکوڵێتەوە! با بکوڵێتەوە و تێکیوەردە!

جۆرجیش ئەو کارەی کرد.

خانمی کرانکی وتی: ئێوە ناتوانن لەو مادەیە دروست بکەن. لە بیرتان بێ تەنیا مەوادەکە گرنگ نییە بەڵکو ئەندازەی مەوادەکە گرنگە. بۆ ئەندازەکەی چی دەکەن؟

بەرێز کرانکی هاواری کرد: ئەتۆ کارەت پێی نەبێ! بۆ خۆمان دەزانین چی دەکەین! ئەو جارەی دەرمانەکە دروست دەبێ، دەبینی سەردەکەوین!

ئەوە چوارەمین دەرمانی ئەفسوناوی جۆرج بوو و کاتێك دوو خولەك کوڵیی، جۆرج جاریکی تر کوپێکی لێ پڕ کرد و رایکردە ناو حەوشە.

بەرێز کرانکیش بە دوایدا رایکرد. خانمی کرانکی بە ئارامی بە دوایاندا رۆیشت و وتی: ئەگەر بەمشێوەیە بەردەوام بن تەنیا چەند مریشکی سەیر و سەمەر بەسەر دەستماندا دەمێننەوە.

بەرێز کرانکی هاواری کرد: جۆرج خێراکە تێیکە! و ئیشارەی بۆ مریشکێکی قاوەیی کرد و وتی: کەوچێکی بدە بەو مریشکەی لە هۆوێیە!

جۆرج دوولا هاتەوە کەوچکێکی لە دەرمانە نوێیەکە لە پێش راگرت: وەرە، وەرە...کەمێکی لێ بخۆ.

مریشکە قاوەیەکە هاتە لای جۆرج و سەیری کەوچکەکەی کرد. دوایی دەنووکی لێدا.

دەنگێکی سەیر لە مریشکەکە هاتە دەر! و دوایی دەنووکی فیتەیەکی بێ مانای لێهات.

بەرێز کرانکی هاواری کرد: سەیرکەن، ئێستا گەورە دەبێ!

خانمی کرانکی وتی: زۆر دڵنیا مەبە، بۆچی ئەو دەنگەی لێ هاتە دەر؟

بەرێز کرانکی قیژاندی: ئەتۆ بێدەنگ بە! کەمێك سەبر بگرە!



ئەوان راوەستان و چاویان لە مریشکە قاوەیەکەوە بڕی.

جۆرج وتی: باوکە سەیرکە مریشکەکە خەریکە بچووك دەبێتەوە. بەرە بەرە بچووك دەبێتەوە، وەك ئەوەی بە ئاودا بچێ.

بەراستیش بە ئاودا دەچوو. کەمتر لە خولەکێك، مریشکەکە بە ئاودا چوو، ئەوەندە بچووك بۆوە بە ئەندازەی ئەو کاتەی لێهات کە تازە لە هێلکەی هاتۆتە دەر. بەراستی پێکەنیندار بوو.

# خوا حافیز نەنەگیان

بەڕێز کرانکی وتی: هێشتاش شتێك ماوە کە تۆ لە بیرت کردووە!

جۆرج وتی: پێموانییە شتێکی تر مابێ.

خانمی کرانکی وتی: کۆتایی پێی بێنن. بەسە. هەرگیز ناتوانن ئەو دەرمانە دروست بکەن. بەڕێز کرانکی بە نا ئومێدیەوە سەیری کرد.

جۆرج زۆر نیگەران بوو. هێشتاش بە هەمان شێوە بە کەوچك و کوپی پڕ لە دەرمانەوە لەسەر ئەرز دانیشتبوو. مریشکی قاوەیی و وردیلە بە شێوەیەکی نالەبار بەولاو بەملادا دەرۆیشت.

لە هەمان کاتدا نەنکم بە هەنگاوە بلّندەکانی هاتە حەوشە. لەو بەرزایە زۆرەوە، سەیری خوارەوەی کرد، ئەو سێ کەسەی بینی و هاواری کرد: لێرە چی روویداوە؟

بۆچی کەسێك پیاڵە چایەکم ناداتیێ؟ نوستن لە ناو حەوشە لەگەڵ مشکان بە ئەندازەی پێویست ناخۆشە، بەڵام ئەگەر قەرار بێ برسیایەتیش بکێشم ئەوە لە ناو دەچم! نە چایەك! نە هێلکەیەك! نە سەمون و نە رۆنە کەرەیەك!

خانمی کرانکی وتی: ببورە دایە، ئێمە زۆر سەر قاڵ بووین. ئێستاکە شتێکت بۆ دێنم.

نەنە هاواری کرد: با جۆرج نانی بەیانیم بۆ ئامادە بکات. کوڕێکی تەمبەل و بێ کەڵکە!

پیرێژن چاوی بەو کوپە کەوت کە بە دەست جۆرجەوە بوو. دوولا هاتەوە و سەیری ناوەوەی کرد. دیتی کوپەکە پڕە لە شلەیەکی قاوەیی کە لە چا دەچوو. نەنکی قیژاندی، ئای! ئەوە کاری تۆ بوو، وایە! تۆ تەنیا بیر لە خۆت دەکەیەوە! وایە! راستە! پیاڵێکت چا بۆ خۆت دروست کردووە! بەڵام لە بیرت نەبوو پیاڵەیەکیش بۆ نەنکە داماوەکەت بێنی! من هەمیشە دەمزانی تۆ بەرازێکی خۆ پەرستی!

جۆرج وتی: نا نەنەگیان، ئەوە چا...

پیرێژنی نالەبار و درێژ هاواری کرد: درۆ مەکە! ئەو کوپەی بدە بە من!

خانمی کرانکی هاواری کرد: نا، نا، دایە ئەو کارە مەکە! بە کەڵکی تۆ نایەت!

نەنکی وتی: تۆش دوژمنی منی! کچەکەم رێگەم پێی نادات نانی بەیانی بخۆم! دەیەوێ لە برسان بمکوژێ!

بەرێز کرانکی سەیری پیرێژنە ناشیرین و ترسناکەکەی کرد و زەردە خەنەیەکی کرد و وتی: بەدڵنیاییەوە هی تۆیە. تا گەرم و بە تامە بیخۆوە.

نەنە بەو باڵا درێژەیەوە دوولا هاتەوە تا دەستە قەڵشیو و گەورەکانی بۆ وەرگرتنی کوپەکە درێژ بکات و وتی: وا مەزانە ئەو کارە ناکەم! جۆرج کوپەکەی بدە بە من!

جۆرج کوپەکەی بردە ئەو لای و هاواری کرد: نا، نا، نەنەگیان! نابێ بیخۆیەوە، بە کەڵکی تۆ نایەت!

نەنکی نەڕاندی: خێراکە بیدە بە من!

خانمی کرانکی هاواری کرد: نا. ئەو دەرمانەی جۆرج...

نەنکی هاواری کرد: لێرە هەموو شتێك هی جۆرجە! هۆوە هی جۆرجە! ئەوە هی جۆرجە!

ئەو کوپەکەی لە دەست جۆرج فڕاند و وتی: ئیتر سەبر وتاقەتم نەما!



بەرێز کرانکی بە پێکەنینەوە وتی: نەنەگیان، بیخۆوە نۆشی گیان، چایەکی زۆر خۆشە.

جۆرج و دایکی هاواریان کرد: نا، نا،مەیخۆ.

بەلاّم ئیتر زۆر درەنگ ببوو. ئەو پیرێژنە درێژە کوپەکەی بە لێوەیەوە نا و هەمووی هەڵلوشی.

خانمی کرانکی دەستی کرد بە گریان: دایە! تۆ بە ئەندازەی ٥٠ کەوچك دەرمانی ئەفسوناوی ژمارە چوارت خواردۆتەوە و ئێستاش بینیت نووکێك لەو دەرمانە چی بەسەر ئەو مریشکە قاوەیە هێنا. ئەوی کرد بە جوجەڵەیەك کە تازە لە هێلکە هاتۆتە دەر!

بەلاّم نەنە گوێی لە هیچ نەبوو. دوکەڵ و فیتە فیتی لە زاری دەهاتە دەر.

بەرێز کرانکی کە هێشتاش هەرخەریکی پێکەنین بوو وتی: لەرادەبەدەرە!

خانمی کرانکی بە مۆڕەوە بەسەر هاوسەرەکەیدا هاواری کرد: ئێستا دەرمانەکە کاریگەر دەبێ! ئەتۆ ئەو بەلاّیەت بۆ پیرێژن نایەوە!

بەرێز کرانکی وتی: من هیچ کارێکم نەکردووە!

خانمی کرانکی وتی: هەمووی خەتای تۆ بوو، تۆ پێت وتی بیخواتەوە!

دەنگی فشەفشێکی زۆر لە سەر سەریانەوە دەهات. هەر هەڵم بوو لە زار و لوت و گوێی نەنە دهاتە دەر و فیتەی دەدا.

بەرێز کرانکی وتی: دوای ئەوەی هەڵمەکە تەواو بوو حاڵی باشتر دەبێ.

خانمی کرانکی بە گریانەوە وتی: خەریکە دەتەقیٚ! ئیٚستا وەك مەنجەڵی بوخار دەتەقیٚ.

بەریٚز کرانکی بە جۆرجی وت: ساف راوەستە!

جۆرج وشیار ببۆوە. بڵند بوو و چەند هەنگاو رۆیشتە پشتەوە. هەڵمیٚکی سپی بەردەوام لە کەللەسەری ئەو پیریٚژنە پیر و عەجوزەیە دەهاتە دەر و فیتەکەی ئەوەندە زۆر و بەهیٚز بوو، دەبوو بە هۆی ئازاری گویٚ.

خانمی کرانکی هاواری کرد: ئاگر کوژیٚنەوە خەبەرکەن! پۆلیس! سۆندەی ئاو!

بەریٚز کرانکی بە خۆشحاڵیەوە وتی: ئیتر زۆر درەنگ بووە!

خانمی کرانکی دەلەرزی: ئاخ نەنەگیان! دایە! برۆ بۆ سەر حەوزەکە و سەرت بخە ژیٚر ئاوەکە!

لە کاتیٚکدا قسەی دەکرد، دەنگی فیتەکە نەما و هەڵمەکەش کۆتایی پیٚهات. و ئەو کاتە بوو نەنە دەستی کرد بە بچووك و بچووکتر بوونەوە. سەری لەسەر خانوەکان کورت کورتتر بۆوە بەڵام ئیٚستا هەموو لەشی بە خیٚرایی بچووك دەبۆوە.

بەریٚز کرانکی بە خۆشحاڵیەوە بە دەوری حەوشەدا دەسوڕایەوە و دەستەکانی لیٚکدەدا، هاواری کرد: جۆرج سەیرکە! کاتیٚك کەسیٚك پەنجاە کەوچك لەو دەرمانە بخوات چی بەسەر دیٚ!



نەنە زۆر بە خێرایی وەك جارانی لێهاتەوە.

خانكی كرانكی هاواری كرد: ئەوەندە بەسە، رێك بە ئەندازەی پێشوویەتی.

بەڵام نەنە بەردەوام بچووك و بچووكتر دەبۆوە... و بۆ خوار و خواروتر چوو. لە ماوەی نیو خولەك بە ئەندازەی شوشە شەربەتێكی لێهات.

خانمی كرانكی بە توڕییەوە پرسی: دایە حاڵت چۆنە؟

دەموچاوی وردی نەنە هێشتاش حاڵەتی بێ ڕەحمی جارانی پێوە دیار بوو. چاوەکانی کە تا ئێستا وا گەورە نەدەهاتنە بەر چاو، هێندە توڕە بوو دەبریسکانەوە. هاواری کرد: حاڵی من چۆنە؟ پێتوایە چۆنە؟ ئەگەر تا چەند خولەك لەمەوپێش کەسێکی زەبەلاح و بەشکۆ بووبی و لە ناکاو ببی بە وردیلە و قەزەمێکی داماو، چ هەستێکت دەبوو؟



بەرێز کرانکی بە خۆشحاڵیەوە هاواری کرد: هێشتا ئەو مەسەلەیە هەر بەردەوامە، هەر بچووکتر دەبێتەوە! و هەرواشی لێهات، نەنە هەر بچووك دەبۆوە.

کاتێك نەنە بە ئەندازەی جگەرەیەکی لێهات، خانمی کرانکی لە ناو دەستی هاویشت. لە هەمان کاتدا هاواری کرد: چی بکەم تا بچووکتر نەبێتەوە؟



بەرێز کرانکی وتی: هیچی لەگەڵ ناکرێ. ئەو پەنجاە ئەوەندەی دەبوو بیخوات، خواردویەتی.



خانمی کرانکی بە شین و گریانەوە وتی: دەبێ بیوەستێنی. ئیتر بە زەحمەت دەبینرێ!

بەرێز کرانکی وتی: لە هەردوو لاوە بیگرەو رایکێشە!

و دوایی نەنە بە ئەندازەی دەنکە شقارتەیەکی لێهات و بەڵام هەر بە ئاودا دەچوو!



چرکە ساتێك دواتر، بە ئەندازەی یەك دەموزی لێهات...



دوایی بە ئەندازەی دەنکە کولەکەیەکی لێهات



دواتر...



و دواتر...



خانمی کرانکی هاواری کرد: لە کوێیە، لێم وون بوو!

بەڕێز کرانکی وتی: هوراااا!

خانمی کرانکی قیژاندی: ئەو ڕۆیشتووە! بە تەواوی بزر بووە!

بەرێز کرانکی وتی: ئەگەر تۆش سەر و زمانت توند و ناخۆش بێ ئەو بەڵایەت بەسەر دێ. جۆرج ئەوە کاریگەری دەرمانە نایابەکەی تۆیە!



جۆرج نەیدەزانی چی بکات.

بۆ چەند چرکە ساتێك خانمی کرانکی پەرێشان بەولاو بەملادا دەگەڕا و وتی: دایە لە کوێیی؟ بۆ کوێ چووی؟ لە کوێ کەوتوویی؟ چۆنت بدۆزمەوە؟ بەڵام زۆر بە خێرایی ئارام بۆوە. نیوەڕۆ کاتی نان خواردن وتی: وابزانم بۆ هەمووومان وا باشترە.

نەنە لە ناو ماڵێدا کەمێك بێزارکەر بوو، نا؟ بەرێز کرانکی وتی: بەڵێ، بەراستی بێزارکەر بوو.

جۆرج هیچی نەوت. دڵەکوتەی لێ بوو. مات و بێدەنگ بوو. دەیزانی بەیانی ئەو رۆژە شتێکی لەرادەبەدەر روویداوە. ئەو بۆ چەند چرکەساتێك بە سەر پەنجەکانی لێواری دنیایەکی جادوویی هەست پێکردبوو.



نەنە وتی: هەرکاتێک هێلکە شەیتانەیەکی زیندوو لەسەر گەڵای کاهو دەبینم خێرا دەیخۆم بۆ ئەوەی ڕا نەکات. نازانی چەند بەتامە!

نەنکە پیر و بە پرتە و بۆڵەی جۆرج لە خواردنیشدا خووی سەیر و سەمەری هەیە. جۆرج کە ئیتر تاقەتی ئەو خووانەی نییە بڕیاریدا بۆ هەمیشە ئەو خووڕەوشتە ناپەسند و نالەبارانەی چاک بکات. دەرمانێکی تایبەت دروست دەکات کە لە خراپیدا، چی وای لە رەفتاری نەنکی کەمتر نییە... بە ئەنجامێکی موعجیزاوی!



نرخ (٢٠٠٠) دینار
1 000000 000035

خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
MUKIRYANI HOUSE FOR PRINTING & PUBLISHING
www.mukiryani.com
2015

Redar.J